# ماڵئاوایی

# هاوەڵانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم



نوسینی
نهاد جلال حبیب اللّٰه

# پێشکەشە

بەوەی نزایەکی خێر بۆ باوکی کۆچکردووم دەکات

بە دایکی ئازیزم، براو خوشکەکانم، هاوسەر و منداڵەکانم.

بە سەرجەم موسڵمانان، بەڵکو بە سەرجەم مرۆڤایەتی.

# پێشەکی

سوپاس و ستایشی بێپایان بۆ خوای گەورە، صەلات و سەلامی خوا لە پێغەمبەری خوا و ئالوبەیتی.

ژیانی دنیا بۆ مرۆڤەکان حەسانەوەیەکی کاتی و خۆئامادەکردن و توێشوو پێچانەوەیەکی یەکجارەکیە بۆ ژیانی ئاخیرەت، ئەم مۆڵەتە هەتا سەرمەرگەو پاش ئەوە دەرگای کار دادەخرێت و حەق و حیسابی کەسەکە دەوەستێنرێت و کەم و زیادی تێدا ناکرێت، بەم چەشنە نە دەتوانێت شتێ زیاتر توێشوو لەگەڵ خۆی ببات، نە دەتوانێت گسکێ بدات لە تاوانەکانی یان بە هیچ نا چەند دانەیەکیشیان بسڕێتەوە، مەگەر تەنها ئەو سێ تاقمەی کە لە فەرموودەدا ئاماژەیان پێ دراوە (سامانێك کە لە پڕۆژەی خێریدا بەکارهاتبێت، منداڵێکی چاك کە دوای مەرگی دایك و باوکی نزای خێریان بۆ بکات، زانستێك کە دوای خۆت جێی بهێڵیت).

زۆرجار مرۆڤەکان چاویان لە دنیایە و پشتیان لە ئاخیرەت، بێ ئەوەی هیچ زامنێکیان وەرگرتبێت چەندە لە دنیادا دەمێننەوە، بۆیە کاتێك لە کتوپڕێکدا خشپەی مەرگ دەبیستن، شپرزە ئەبن، چونکە پێشوەختە چاوەڕێی نەبوون و بیریان لێ نەکردۆتەوە.

دیدی ئیسلام بۆ مەرگ ڕوانینێکی ترس و نامۆیی نیە، وەك چۆن تێڕوانینی بۆ ژیان لە بێزاری و تاسەی مەرگەوە سەرچاوەی نەگرتووە، ئیسلام پێمان دەڵێت تا لە ژیاندایت بەختەوەر بژی، چی پاکە بۆ خواردن و پۆشین و نۆشین و

هاوسەرگیری کەمتەرخەم مەبە تیایدا، مافی جەستەو روخسار و ناخت بدە، خۆشی ببەخشە بە چواردەورت، هیچ کات ئاوات بە مەرگ مەخوزاە، ئاوات خواستن بە مەرگی قەدەغە کردووە، بەڵام کە مەرگ هات پێشوازی لێدەکات، پێت دەڵێت مەرگ مەرگی جەستەیەو گواستنەوەی رۆحتە بۆ دنیای ئاخیرەت، لەو ساتەدا گەشبین بە، زمانت بە یادی خوا رام بێنە، سەلمان ئاسا ماڵت بۆنخۆش بێت، کە کەسەکەش مرد، با بشۆردرێت و بە بەرگی پاك كفن بكرێت، بۆنخۆش بكرێت، نوێژی لەسەر بكرێت، کەس لە پێش تەرمەکەوە نەڕوات، هەرکەس دانیشتووە هەستێتەسەر پێ با تەنانەت تەرمی جوولەکەو گاوریش بێت، ئەسپەردە بکرێت و نزای خێری بۆ بكرێت، واز لە خراپەکانی بهێنن و باسی چاکەکانی بکەن.

هاوەڵانی پێغەمبەریش (ﷺ) پێش هاتنی پێغەمبەری خوا لە دنیایەکی دوور لە خواناسیندا دەژیان، دوورنەبوو ئەوانیش لە هەمان حاڵەتدا دنیایان جێ بهێشتایە، بەڵام فەزڵی خوا وابوو پێش مردنیان مۆرکی هاوەڵبوون وەربگرن و بەو تایبەتمەندیانەوە بگەڕێنەوە، دینەکە وەربگرن و بیگەیەنن و توێشوویەك پێش خۆیان بخەن ئینجا بمرن، هەتا ئاستێ خوای گەورە شایەتی رەزابوونی بۆ دان و لێیان رازی بوو، بەڵێنی پاداشت و بەهەشتی پێ دان.

لەم ڕوانگەوە بە چاکمان زانی گوڵبژێرێ لە ساتەوەختی وەفات و ماڵئاوایی چەند هاوەڵێکی پێغەمبەر (ﷺ) بکەین و چل و یەك نموونەمان لەم

پەرتووکەدا خستۆتەڕوو، سەرەتاش ناسینێکی زۆر کورتی هەر هاوەڵێکمان هێناوە، ئینجا باسی حاڵەتی مردن و ماڵئاواییەکەیمان کردووە.

بەو هیوایەی خوای گەورە ئەمەی بە چاکە لێ وەرگرتبێن و خوێنەری ئازیزیش لێی سوودمەند بێت و لە نزای خێر بێبەشمان نەکات، نووسینەکەش ببێتە مایەی خێر بۆ هەر خوێنەر و بیسەرێکی خۆشەویست.

**إن أريد إلا الإصلاح ما استطعت**
**وما توفيقي إلا بالله عليه توكلت و إليه أنيب**

نهاد جلال

سلێمانی

جمادي الأول ١٤٣٩

## یەکەم: ماڵئاوایی ئەبووبەکری صدیق (رضي الله عنه)

عەبدوڵای کوڕی عوثمانی کوڕی عامیری قوڕەیشی تەیمی، کونیەکەی ئەبوبەکرەو بە صدیق ناسراوە، نزیکترین و ئازیزترین هاوەڵی پێغەمبەرە(ﷺ) و یەکێکە لە موژدەپێدراوانی بەهەشت و یەکەم خەلیفەی راشیدینە،[١] ئەبووبەکر بە هەریەك لە عەتیق و صدیق ناسرابوو،[٢] کەسێکی لەڕی باڵابەرزی سپی پێست بوو، دەموچاوی قەڵەو نەبوو، خەنەوسمەی بەکاردەهێنا.[٣]

ئەبووبەکر لە سەردەمی نەفامیشدا هاوەڵێکی نزیك و دۆستی هەمیشەیی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو.[٤]

خەڵکی مەککە زۆر تێکەڵی ئەبووبەکر دەبوون و لە دەوری بوون، چ لەبەر خۆشی کۆڕەکانی وقسەکردنی، چ لەبەر سەرقاڵبوونی بە کاری بازرگانی، چ لەبەر ئەو زانستەی کە هەیبوو.[٥]

ئەبووبەکری صدیق یەکەم کەس بوو موسڵمان بوو و یەکەم کەسیش بوو لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی کرد،[٦] هەروەها یەکێك بوو لەو حەوت کەسە

١ - أسد الغابة، ج٣، ص ٣١٥.
٢ -نهاية الإرب للنويري، ج١٩، ص ٨-٩.
٣ - نهاية الإرب للنويري، ج١٩، ص ٢٤.
٤ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ١٦٩.
٥ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ١٧١.
٦ -نهاية الإرب للنويري، ج١٩، ص ١١.

یەکەمەی کە لە مەککە ئیمانی خۆیان ئاشکراکرد،[١] هەروەها یەکێکە لە موژدەپێدراوانی بەهەشت.

پێغەمبەر (ﷺ) رۆژانە بەیانی و ئێوارە سەردانی ماڵی ئەبووبەکری صدیقی دەکرد.

ئەبووبەکری صدیق سامانێکی زۆری هەبوو، بەڵام هەمووی بۆ سەرخستنی بانگەوازی ئیسلامی خەرج کرد.[٢] هەروەها لە هەموو غەزاکاندا بەشداری کرد و تاکە غەزایەك نەبوو تیایدا بەشداری نەکردبێت.

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد، ئەبووبەکر پێغەمبەری خوای(ﷺ) ماچ کرد،[٣] کە هاتە ژوورەوەو بینی پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کردووە، ماچی کرد و فەرمووی بە دایك و باوکمەوە بە قوربانت بم، بە زیندوویی و مردوووییش بۆنت خۆشە، سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە خوا هەرگیز دوو مەرگت پێ نۆش ناکات، دواتر چووە دەرەوەو هەواڵی مەرگی پێغەمبەری خوای(ﷺ) بە خەڵکەکە گەیاندو پێی وتن هەرکەس موحەممەدی دەپەرست ئەوە موحەممەد مرد، هەرکەسیش خوا دەپەرستێت ئەوە خوا زیندووەو نامرێت، چەند ئایەتێکی خوێندەوەو خەڵکیش دەستیان کرد بە گریان.[٤]

---

١ - أسد الغابة، ج٣، ص ٤٠.

٢ - نهاية الإرب للنويري، ج١٩، ص ١٣.

٣ - صحيح البخاري، الرقم ٤١٩٧، مسند احمد بن حنبل، الرقم ١٩٥٣.

٤ - صحيح البخاري، الرقم ٣٤٨٨.

له مانگی جومادیلئاخیرەی ساڵی سیانزەی کۆچیدا ئەبووبەکری صدیق تووشی نەخۆشی بوو و ماوەی نزیکەی پانزە رۆژ نەخۆشیەکەی بەردەوام بوو، لەو ماوەدا عومەری کوڕی خەططاب بەرنوێژی دەکرد بۆ موسڵمانان، لەو ماوەدا ئەبووبەکری صدیق عومەری کوڕی خەتتابی بۆ جێگرتنەوەی خۆی دیاری کرد و عوثمانی کوڕی عەففانی بانگ کرد و داوای لێکرد بە نووسراوێك ئەوە بنووسێت، ئینجا نووسراوەکە خوێنرایەوە بەسەر موسڵماناندا و ئەوانیش رازی بوون.[1]

کاتێك ئەبووبەکری صدیق نەخۆش کەوت، عەبدورەحمانی کوڕی عەوفی بانگ کرد و وتی هەواڵی عومەرم پێ بدە، ئەویش وەسفی کرد و وتی بەڵام توندیەکی تێدایە، ئەبووبەکر وتی ئەوە لەبەرئەوەیە کە منی دیوە نەرم بوم بۆیە، ئەگەر خۆی بێت زۆرێك لەوەی هەیەتی وازی لێدێنێت.[2]

ئەبووبەکری صدیق لە بیست و دووی جومادیلئاخیرەی ساڵی سیانزەی کۆچیدا وەفاتی کرد،[3] ئەو رۆژەی وەفاتی کرد رۆژی دووشەممە بوو، دەوترێت لە بەرەبەیاندا وەفاتی کرد، رایەکیش دەڵێت بەڵکو دوای نوێژی ئێوارە وەفاتی کرد، تەمەنیشی شەست و سێ ساڵان دەبوو.[4]

---

١ - البداية و النهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٨.

٢ - الكامل في التأريخ، ج٢، ص ٢٧٢.

٣ - تاريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص ٨٧.

٤ - البداية و النهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٨.

حەسەن ئامادەی کاتی وەفاتی ئەبووبەکری صدیق بوو، حەسەن دەڵێت کاتێك ئەبووبەکر سەرەمەرگی هات بە عائیشەی وت ئەی عائیشە سەیری ئەو وشترە بکە کە لە شیرەکەیمان دەخواردەوەو ئەو تەشتەی بەکارمان دەهێنا و ئەو بەرگەی دەمانپۆشی، ئێمە کاتێك کاروباری موسڵمانانمان بەدەست بوو ئەو شتانەمان بەکاردەهێنا، جا ئەگەر مردم ئەوانە ببە بۆ عومەر، ئەوەبوو کە ئەبووبەکر مرد ئەو شتانەی نارد بۆ عومەر، ئەویش وتی خوا لێت رازی بێت ئەی ئەبووبەکر، باری کەسانی دوای خۆتت قورس کرد.[١]

ئەسید باسی ئەو رۆژە دەکات کە خەلیفەی موسڵمانان ئەبووبەکری صدیق کۆچی دوایی کردو دەڵێت:

کاتێ ئەبووبەکر وەفاتی کرد بە بەرگێ دایانپۆشیو گریان مەدینەی گرتەوەو خەڵکی شڵەژان چەشنی ئەو رۆژەی پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوایی کرد، عەلی کوڕی ئەبووطالیب خێرا بە گریانەوە گەڕایەوەو دەیفەرموو (ئەمڕۆ خیلافەتی پێغەمبەر (ﷺ) دابڕا)، ئینجا هات تا گەیشتە بەردەرگای ئەوماڵەی ئەبووبەکری تێدا بوو، وەستاو وتی: (بەر رەحمەتی خوا کەویت ئەی ئەبووبەکر، تۆ یەکەم کەس بوویت موسڵمان بوویت، لەهەمووان پوختترو دڵسۆزانەتر باوەڕت هێنا، دڵنیاییو بێگومانیت لە هەموان زیاتر بوو، لە هەموان لەخواترس ترو دەوڵەمەندتر بوویتو لە هەموان زیاتر لە دەوری پێغەمبەر (ﷺ) بوویت... پلەوپایەت لە

١ - المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٣٦.

هەموویان بەرزتر بوو، پێشرەوی هەموویان بوویت، پلەت لەهەموویان بەرزتر بوو، لە هەموویان زیاتر لە پێغەمبەری خواوە نزیك بوویت، لەرووی رەوشتو هەڵوێستەوە لە هەموان زیاتر لە پێغەمبەر (ﷺ) دەچوویت، لای پێغەمبەر (ﷺ) لە هەموویان جێ متمانەترو پایەبەرزتر بوویتو بەڕێزتریان بوویت لە خزمەتیدا، دەی خوای گەورە لەسەر ئیسلامو پێغەمبەرەکەیو موسڵمانان پاداشتی خێرت بداتەوە، کاتێ خەڵکی پێغەمبەری خوایان بە درۆزن دەزانی تۆ بەراستت دەزانی، بۆیە خوای گەورە لە کتێبەکەی خۆیدا بە صدیق ناوی هێنایت (و الذي جاء بالصدق)، کاتێ خەڵکی بەرامبەر پێغەمبەر (ﷺ) پیسکە بوون، تۆ شوێنکەوتەو دڵنەواکەری بوویت، کاتێ خەڵکی دانیشتنو لەگەڵی نەچوون تۆ لەگەڵیدا راوەستایت، لەکاتی سەختیدا بە جوانترین شێوە هاوەڵی ئەوت کرد، سوکناییت بۆ دەهێناو هاوڕێی کۆچو باروحاڵی نارەحەتی پێغەمبەر (ﷺ) بوویت، دوای پێغەمبەر (ﷺ) بەجوانترین شێوە خیلافەتت کرد بۆ ئوممەتەکەی، کاتێ خەڵکی لە ئیسلام هەڵگەرانەوە بەجۆرێك ئاینی خوات بەجێگەیاند کە خەلیفەی هیچ پێغەمبەرێکی پێشتر وا بەجێی نەگەیاندووە، کاتی لاوازی هاوەڵانت بەهێز بوویت، کاتی ترسی ئەوان سەرپێ راوەستایت، وێڕای پێ ناخۆشبوونی دوورووانو بێزاریو توورەیی بێباوەران دەستت گرتبوو بە ڕێبازو بەرنامەی پێغەمبەری خواوە، کاتێ دەورووبەرت شکستیان خوارد بە رووناکی خوا خیلافەتت گرتەدەست، لەسەروو هەموویانەوە بویتو لەهەموشیان کەمتر قسەت دەکردو لە هەموان زیاتر راستیت دەپێکاو لە هەموان زیاتر بێدەنگ دەبوویت، رەوانبێژی و بڕیاردروستیو دلێریو دڵنیاییو کرداری چاكو شارەزاییت بە کارەکان لە هەموان زیاتر بوو، بۆ ئیسلام

سەرگەورەیەك بوویتو بۆ باوەڕدارانیش باوكێكی میهرەبان، كاتێ بە خاوخێزانەوە دەهاتنە لات باری قورسی لاوازی ئەوانت دەگرتە ئەستۆ، چییان لەدەست دەدا تۆ دەتپاراست، چییان پشتگوێ بخستایە تۆ ئاگاداری دەبوویت، كاتی كەمصەبری ئەوان خۆڕاگر بوویت، ئەوەی ئەوان هەوڵیان بۆ دەدا تۆ پێی گەیشتیت، بەهۆی تۆوە گەیشتن بەوەی كە چاوەڕێ نەبوون دەستیان بكەوێ، بۆ بێباوەران سزایەك بوویت و دەرژایت بەسەریاندا، بۆ باوەردارانیش بارانی رەحمەتو بەرەكەت بوویت، بارانی دەوڵەمەندیو سوكناییو پارێزگاری بوویت... وەك شاخێ وابوویت كە رەشەبا نایجووڵێنێتو شكێنەرەكان لەناوی نابەن... كەسی لاوازو زەلیل لای تۆ بەهێز بوو تا مافت بۆ وەردەگرتەوە، كەسی بەهێز و بە دەسە{تیش لای تۆ زەلیلو لاواز بوو تا كاتێ مافت لێ وەردەگرتەوە، لەوەشدا دوور و نزیك لای تۆ وەك یەك بوون... بەخوا پێشڕەیو زۆرت كردو ئەوەی دوای تۆ دێت چاك ماندووی دەكەیت ... رازین بە قەزای خودا و ملكەچی كارو فەرمانی دەبین، دوای وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) موسڵمانان بە هیچ شتێ هێندەی مەرگی تۆ موصیبەتبار نابن... خوای گەورە بتگەیەنێتەوە بە پێغەمبەرەكەتو ئێمەش لە پاداشتت بێ بەش نەكاتو دوای تۆ گومڕامان نەكات) خەڵكی بێدەنگ بووبوون تا وتەكانی تەواو بوون، دواتر هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) گریانو وتیان راستت فەرمووو ئەی ئامۆزای پێغەمبەری خوا (ﷺ).[١]

---

١ - البحر الزخار مسند البزار، الرقم ٨٣١، الشريعة للآجري، الرقم ١٧٨١، السنة لأبي بكر بن الخلال، الرقم ٣٤٦، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٨٤١.

## دووەم: ماڵئاوایی عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه)

عومەری کوڕی خەططابی کوڕی نوفەیلی قوڕەیشی عەدوی، کونیەکەی ئەبووحەفصە.[١]

عومەر بە فاوورقیش ناسراوە، چونکە کاتێك موسڵمان بوو ئیتر بێباوەڕان نەیاندەوێرا وەك جاران ئازاری موسڵمانان بدەن، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) ناوی نا فارووق.[٢]

عومەر کەسێکی باڵابەرزی بەخۆ بوو، رەنگی سوور بوو، رایەکیش دەڵێت سەرەتا عومەر سپی رەنگ بووە، بەڵام دواتر کە لە سەردەمی خیلافەتەکەیدا وشکەساڵی روویدا هێندە خۆی گرتەوە لە خواردن کە رەنگی تێکچوو.[٣]

عەمری کوڕی عاص دەڵێت پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کێ زۆر لات خۆشەویستە؟ فەرمووی عائیشە، وتیان ئەی لەپیاوان؟ فەرمووی ئەبووبەکر، وتیان دواتر، فەرمووی عومەر، وتیان دواتر، فەرمووی ئەبووعوبەیدەی کوڕی جەراح.[٤]

---

١ - أسد الغابة، ج٤، ص ١٥٦.

٢ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ٥٩٠.

٣ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ٥٨٩.

٤ - صحيح ابن حبان، الرقم ٧١٠٨، صححه شعيب الأرناؤوط.

کاتێك ئەبووبەکری صدیق نەخۆش کەوت، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفی بانگ کرد و وتی هەواڵی عومەرم پێ بدە، ئەویش وەسفی کرد و وتی بەڵام توندیەکی تێدایە، ئەبووبەکر وتی ئەوە لەبەرئەوەیە کە منی دیوە نەرم بوم بۆیە، ئەگەر خۆی بێت زۆرێك لەوەی هەیەتی وازی لێدێنێت.[١]

عومەری کوڕی خەططاب بوو بە خەلیفە و ماوەی دەسەڵاتی پڕ بوو لە سەروەری و فتوحات و دادپەروەری.

عومەری کوڕی خەططاب لە کۆتا حەجیدا–لەساڵی ٢٣ کۆچی– نزایەکی کرد کە تاسەی مەرگی تێدا بوو، دەستەکانی بەرەو ئاسمان بەرز کردەوەو وتی: خوایە، تەمەنم زۆرەو توانام کەمی کردووەو ناوچەی دەسەڵاتم فراوان بووە، دەی خوایە تا نەفەوتاوم بمبەرەوە بۆ لای خۆت.[٢]

هەروەها عومەر نزای دەکرد(خوایە شەهیدیەکم پێ ببەخشە کە لەرێی تۆدا بێت، مەرگیشم بخەرە ناو شارەکەی پێغەمبەرەکەتەوە).[٣]

ئەم کارەی عومەر شتێکی نامۆ نەبووە لەناو هاوەڵاندا، بەڵکو هاوەڵانێك کە ترساون لەوەی تووشی فیتنە بن نزای مەرگیان کردووە، بۆ نموونە:

---

١ - الكامل في التأريخ، ج٢، ص ٢٧٢.

٢ - موطأ مالك، الرقم ١٥٠٢، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٤٦٢.

٣ - صحيح البخاري، الرقم ١٨٠٠.

حەسەنی کوڕی ئەبیلحەسەنی بەصری دەڵێت حەکەمی کوڕی عەمر–کە هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) بوو– کە نزای مەرگی کرد وتی ئەی تاعوون وەرە بمبە بۆ لای خۆت، کەسێك پێی وت باشە تۆ چۆن وا دەڵێیت لەکاتێکدا بیستووتە لە پێغەمبەر (ﷺ) کە دەیفەرموو (کەستان لەبەر خراپەو زیانێك کە تووشی دەبێت ئاوات بە مەرگ نەخوازێت)، حەکەم وتی بەڵێ من ئەو فەرموودەم بیستووە، بەڵام دەمەوێت پێش شەش شت بکەوم و نەگەم بەوانەو پێش ئەوانە بمرم: فرۆشتنی دادوەری...[١]

سەبارەت بە حوکمی داواکردنی مەرگ لە شەرحی ئەو فەرموودەدا کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت (کەستان لەبەر خراپەو زیانێك کە تووشی دەبێت ئاوات بە مەرگ نەخوازێت) ئیبن حەجەر دەڵێت: ئەم گوتارە بۆ هاوەڵان و موسڵمانانی دواتریشە، سەبارەت بەوەی فەرموویەتی لەبەر زیانێك داوای مەرگ نەکرێت دەستەیەك لە زانایانی پێشین پێیان وایە مەبەستی زیان و نارەحەتی دنیاییە، ئەگەرنا ئەگەر بینی زیانەکە بۆ ئاخیرەتی بوو و ترسا دینەکەی تووشی فیتنە بێت ئەوە رێگری نەکراوە لە داوای مەرگ، دەستەیەك لە هاوەڵانیش ئەوەیان کردووەو –لە ترسی زیانی ئاخیرەت– داوای مەرگیان کردووە، وەك لە مەوطائدا هاتووە عومەر داوای مەرگی کردووەو وتوویەتی خوایە تەمەنم زۆر بووەو توانام کەمی کردووەو هاوڵاتیانیشم بڵاوبوونەتەوە، دەی بمبەرەوە بۆ

١ - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٥٨٦٩، سكت عنه الذهبي.

لای خۆت،...سەبارەت بەوەش کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (ئەگەر هەرکامتان هەر ناچار بوو –ئاوات بە مەرگ بخوازێت– با بڵێت خوایە بممرێنە ئەگەر مەرگ خێرە بۆم) ئەوە ئاماژەیە بەوەی ئەو شێوە داواکردنە رێگری لێنەکراوەو راستەوخۆ داواکردنی مەرگ نیشاندانی جۆرێك لە نارەزایەتیە.[١]

عەمری کوڕی مەیموون دەڵێت چەند رۆژێك پێش ئەوەی عومەر بریندار بکرێت، من عومەرم بینی کە لەگەڵ حوذەیفەی کوڕی یەمان و عوثمانی کوڕی حونەیفدا وەستابوو، سەبارەت بە کاروباری وڵات قسەیان دەکرد، دواتر عومەر وتی خوا سەلامەت بمهێڵێت بێوەژنانی عێراق وا لێدەکەم دوای من پێویستیان بە هیچ پیاوێ نەبێت، دوای چوار رۆژی تر بریندار کرا، من ئەوکات لە نزیکیەوە بووم، تەنها عەبدوڵای کوڕی عەبباس لە نێوانماندا بوو، نوێژی بەیانی بوو، بە نێو ریزەکاندا دەگەڕاو دەیوت رێك راوەستن، تا هیچ لارو وێریەکی بەدی نەدەکرد ئینجا دەگەڕایەوە شوێنی خۆی، دوای ئەوە چوویە پێشەوەو نوێژی دابەست و وابزانم لە رکاتی یەکەمدا سوورەتی یووسف یان سوورەتی نەحلی خوێند، تا ئەوەی خەڵکی هاتن، هێندەی نەبرد گوێم لێ بوو هاواری کرد سەگەکە کوشتمی–یان سەگەکە خواردمی–، کابرای بێزراو بە چەقۆیەکی دووسەرەوە بۆی هەڵهات و بە راست و چەپدا خەڵکەکەی دەپێکا تا ئەوەی سیانزە کەسی بریندار کرد و حەوت لەوانەش مردن، یەکێك لە موسڵمانان

---

١ - فتح الباري، ج١٠، ص ١٢٨.

شتێکی دا بەسەریدا و کابراش کە زانی تازە گیراوە خۆی سەربڕی، عومەر دەستی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفی گرت و خستیە پێشەوە تا نوێژەکە بکات بۆ خەڵکەکە، ئەوانەی لە نزیك عومەرەوە بوون زانییان چی روویداوە، بەڵام ئەوانەی دواوە نەیاندەزانی چی بووە، عەبدوڕەحمان نوێژێکی کورتی کرد بۆیان، دواتر عومەر بە ئیبن عەبباسی وت بزانە کێ منی کوشت؟ ئەویش وتی پیشەسازەکە-کە خزمەتکاری موغیرەی کوڕی شوعبە بوو، عومەر وتی خوا بیکوژێت خۆ من چاکەی زۆرم لەگەڵ نواند، سوپاس بۆ خوا کە مەرگمی بە دەستی کەسێك دانەنا کە بانگەشەی موسڵمانێتی بکات، ئینجا عومەر برایەوە بۆ ماڵەوەو ئێمەش لەگەڵی چووینە ماڵەوە، هەندێ دەیانوت چاك دەبێتەوە، هەندێ دەیانوت دەترسین بمرێت، ئینجا بڕێ شەربەت هێنرا تا بیخواتەوە، شەربەتەکەی خواردەوە خێرا هاتە دەرەوە، ئینجا شیری بۆ هێنرا، لە شوێنی برینەکەیەوە هاتە دەرەوە، ئیتر زانییان عومەر نامێنێت، خەڵکەکە دەهاتن بۆ لای و دڵخۆشییان دەدایەوە، ئینجا عومەر وتی بزانن چەندە قەرزارم، حسابیان کرد نزیکەی هەشتاو شەش هەزار قەرزار بوو، ئەویش وتی ئەگەر سامانەکەم بەشی کرد قەرزەکانم بدەنەوە، ئەگەرنا داوا بکەن لە بەنی عەددی-هۆزەکەم-تا قەرزەکەم بدەنەوە، ئەگەر بەوەش تەواو نەبوو ئەوە داوا بکەن لە قوڕەیش و لەوە زیاتر داوا لە کەسی تر مەکەن.

کاتێك عومەری کوڕی خەططاب پێکرا، بە عەبدوڵای کوڕی وت بڕۆ بزانە کێ منی کوشت؟ ئەویش وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەبوولوئلوئەی کۆیلەی

موغیرەی کوڕی شوعبە تۆی کوشت، عومەریش وتی سوپاس بۆ خوا کە مەرگی منی بە دەستی کەسێك نەهێنا کە تاکە سوجدەیەکیشی بردبێت بۆ خوا، ئەی عەبدوڵا بڕۆ بۆ لای عائیشەو پرسیاری لێ بکە بزانە مۆڵەت دەدات لەلای پێغەمبەر (ﷺ) و ئەبووبەکر ئەسپەردە بکرێم؟[١]

عەمری کوڕی مەیموون دەڵێت ئامادە بووم کاتێك عومەر بە عەبدوڵای کوڕی وت بڕۆ بۆ لای دایکی باوەڕداران عائیشەو بڵێ عومەر سەلامت لێ دەکات، دواترپر سیاری لێ بکە بزانە مۆڵەت دەدات لای پێغەمبەر (ﷺ) و ئەبووبەکر ئەسپەردە بکرێم؟ عائیشەش وتی من ئەوەم بۆ خۆم دانابوو، بەڵام ئەمڕۆ لە خۆم دەگوزەرم بۆ عومەر، کە عەبدوڵا هاتەوە عومەر وتی چیت کرد؟ ئەویش وتی مۆڵەتی دا، عومەر وتی هیچ شتێ هێندەی ئەو شوێنە لام گرنگ نیە، جا کە مردم بمبەن بۆ ئەوێ و دواتر سەلام بکەن، دواتر هەمدی بڵێ عومەری کوڕی خەططاب داوای مۆڵەت دەکات، ئەگەر عائیشە هەمدی مۆڵەتی دا ئەوکات ئەسپەردەم بکەن، ئەگەریش دەرفەتی نەدا بمگێڕنەوەو بمبەن بۆ گۆڕستانی موسڵمانان، دواتر وتی بۆ خیلافەت شیاوترین کەس ئەوانەن کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) تا وەفاتی کرد لێیان رازی بوو، جا هەرکەسیان دیاری کرد دوای من ئەوە خەلیفەتانەو گوێڕایەڵی بن،.. وەسیەت بۆ خەلیفەی دوای خۆم دەکەم یەکەمجار لەگەڵ کۆچەریە یەکەمینەکاندا چاك بێت و مافیان بزانێت و شکۆیان

---

[١] - الكامل في التأريخ لابن الأثير، ج٢، ص ٤٤٧.

بپارێزێت، دواتر لەگەڵ پشتیوانان چاك بێت چونكە ئەوا پەنادەر بوون، با چاكەی چاكەكاریان قبوڵ بكات و لەوەشیان خۆش بێت خراپەیەك دەكات.[١]

كاتێك عومەر لە سەرەمەرگیدا بوو، سەری لە كۆشی عەبدوڵای كوڕیدا بوو، وتی ئەی عەبدوڵا سەرم بخەرە سەر خۆڵەكە بەڵكو خوای گەورە بەو بارەوە بمبینێت و رەحمم پێ بكات.[٢]

لە رۆژی یەكشەممەی ساڵی بیست و چواری كۆچیدا عومەری كوڕی خەططاب كۆچی دوایی كرد و تەرمەكەی ئەسپەردە كرا.[٣]

كاتێك عومەری كوڕی خەططاب وەفاتی كرد، سەعیدی زاوای زۆر گریا، پێیان وت بۆچی دەگریت؟ وتی بۆ ئیسلام دەگریم، گورزێكی بەركەوتووە تا رۆژی دوایی شوێنەواری دەمێنێت.[٤]

كاتێك عومەری كوڕی خەططاب كۆچی دوایی كرد، هەریەك لە سەعید و عوثمانی كوڕی عەففان و صوهەیب و ئیبن عومەر دابەزینە ناو گۆڕەكەیەوە.[٥]

كاتێك عومەری كوڕی خەططاب وەفاتی كرد، خەڵكی نزایان دەكرد بۆ عومەر، عەلی كوڕی ئەبووطالیبیش وتی رەحمەتی خوات لێ بێت، هیوام وایە

[١] - صحيح البخاري، الرقم ١٣٣٩.
[٢] - الكامل في التأريخ لابن الأثير، ج٢، ص ٤٤٨.
[٣] - البداية و النهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٤٤.
٤ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٣٧٢.
٥ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٣٦٨.

خوای گەورە لەگەڵ دوو هاوڕێکەت کۆت بکاتەوە–پێغەمبەر (ﷺ) و ئەبووبەکر– چونکە من زۆر جار لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) دەبیست دەیفەرموو من و ئەبووبەکر و عومەر بووین، من و ئەبووبەکر و عومەر وامانکرد، من و ئەبووبەکر و عومەر چووین.[١]

سەبارەت بە کاتی شەهیدبوونەکەی دەوترێت لە رۆژ شەممە لە سەرەتای مانگی موحەرەمی ساڵی بیست و چواری کۆچیدا بووە، دەشوترێت سێ رۆژ پێشتر پێکراوەو دوای سێ رۆژ وەفاتی کردووە، سەبارەت بە تەمەنەکەشی لەکاتی شەهیدبوونیدا هەریەك لە پەنجاو دوو و پەنجا و چوار و پەنجاو پێنج و شەست و شەست و سێ ساڵی هاتووە، واقیدی دەڵێت راستتر لای ئێمە ئەوەیە کە لە تەمەنی شەست ساڵیدا بووە.[٢]

١ - صحيح البخاري، الرقم ٣٤٩٥، صحيح مسلم، الرقم ٤٥٠٦، سنن ابن ماجة، الرقم ٩٧، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٧٨٤٧، مسند احمد بن حنبل، الرقم ٨٧٢.

٢ - تاريخ مدينة دمشق، ج٤٤، ص ١٤.

## سێهەم: ماڵئاوایی عوثمانی کوڕی عەففان (رضي الله عنه)

عوثمانی کوڕی عەففانی کوڕی ئەبیلعاصی کوڕی ئومەییەی قورەیشی ئومەوی، کونیەکەی ئەبوو عەبدولَّا یان ئەبووعەمرە.[١]

پێی دەوترا ذیننورەین واتە خاوەن دوو ڕووناکیەکە، ئەمەش لەبەرئەوەی دووو کچی پێغەمبەری خوای (ﷺ) بەهاوسەر گرتبوو، ئەم فەزڵەش تەنها بۆ عوثمان بووە کە دوو کچی پێغەمبەرێکی خوا یەك دوای یەك بەهاوسەر بگرێت.[٢]

عوثمان شەش ساڵ پاش ساڵی فیل لەدایك بوو، واتە تەمەنی لە پێغەمبەر (ﷺ) کەمتر بوو.[٣]

حەکەمی کوڕی ئەبیلعاص کە مامی عوثمانی کوڕی عەففان بوو، کاتێك زانی عوثمان موسڵمان بووە بەرامبەر بە عوثمان توندی و خراپەی زۆری نواند، کاتێك عوثمانی کوڕی عەففان موسڵمان بوو، حەکەم کە مامی بوو عوثمانی گرت و بە گوریس بەستیەوەو وتی سوێند بەخوا تا نەگەڕێیتەوە سەر ئاینی باوباپرانت ناتکەمەوە، عوثمانیش وتی سوێند بەخوا هەرگیز وازی لێ ناهێنم، کاتێك حەکەم بینی عوثمان زۆر سوورە لەسەر ئایینەکەی وازی لێهێنا و بەریدا.[٤]

---

[١] - أسد الغابة، ج٣، ص ٦٠٦.

[٢] - البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص ٣٤٧.

[٣] - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ٤٥٦.

٤ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٥.

عوثمانی کوڕی عەففان یەکێکە لە موژدە پێدراوانی بەهەشت، کەسێك بووە پێغەمبەری خوا و فریشتەکانیش شەرمیان لێکردووە.

حەفصە دەڵێت رۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) لە ماڵەوە بوو و جلەکەی خستبووە نێوان رانەکانی، ئەوەبوو ئەبووبەکر هات و داوای مۆڵەتی کرد و مۆڵەتی پێدراو هاتە ژوورەوە، پێغەمبەر (ﷺ) هەروەك خۆی مایەوەو خۆی تێکنەدا، ئینجا عومەریش هات و هەمان شت روویدا، ئینجا عەلی هات و هەمان شت روویدا، ئینجا هاوەڵانێکی تر هاتن و پێغەمبەر (ﷺ) هیچ خۆی تێکنەدا و هەر لەو شێوەی خۆیدا مایەوە، ئینجا عوثمان هات و داوای مۆڵەتی کرد، مۆڵەتی پێدرا تا بێتەژوورەوە، خێرا پێغەمبەر (ﷺ) جلەکانی رێککرد، ئینجا کەوتنە قسەکردن و پاش ماوەیەك خەڵکەکە چوون، منیش وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەبووبەکر و عومەری و عەلی و ئەو هاوەڵانەی تر هاتن تۆ هیچ خۆت تێکنەدا، کەچی کە عوثمان هات خێرا خۆت کۆکردەوەو جلەکانت رێککرد، ئەویش فەرمووی: (ألا أستحيي ممن تستحيي منه الملائكة)،[١] (ئایا شەرم نەکەم لە کەسێك کە فریشتە شەرمی لێ دەکات).

١ - مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢٥٨٩٢، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ٣٠١٧، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٩٢٤٩.

لە ڕۆژی یەکشەممەی ساڵی بیست و چواری کۆچیدا عومەری کوڕی خەططاب کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەی ئەسپەردە کرا، سێ ڕۆژ دوای ئەوە بەیعەت درا بە عوثمانی کوڕی عەففان.[١]

ئیبن سەبەئی جوولەکە کەوتە تانەدان لە عوثمان و خۆی بە دڵسۆزی ئیسلام نیشان دا، خەڵکێکی زۆر بە قسەکانی هەڵخەڵەتان و کەوتنە شوێن ڕاکانی و ئەو هەوڵەی خۆیان بە فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە دەزانی، ڕۆژ بە ڕۆژ ئەو بیرەی سەبەئی بڵاو دەبوویەوە، دواجار حاڵەتەکە گەیشتە ئەوەی ئاشووبگێڕان هەوڵی شەهیدکردنی خەلیفەی موسڵمانانیان دا و گەمارۆی ماڵەکەیان دا.

پاش کۆتا وتاری عوثمان لە هەینیدا، تووشی ژانەسەرێك بوو و لە هۆش خۆی چوو، خێرا بردیانەوە بۆ ماڵەوە، نەیارەکانی کە لەو شوێنە جیاوازانەوە هاتبوون، هاتن و گەماری ماڵەکەیان دا، بەرامبەر بەوە خێرا دەستەیەك لە منداڵانی هاوەڵان بە فەرمانی باوکیان چوون بۆ ماڵی عوثمان تا بەرگری لە خەلیفە بکەن، لەوانە حەسەن و حوسەینی کوڕانی عەلی کوڕی ئەبوو طالیب، عەبدوڵای کوڕی زوبەیر و عەبدوڵای کوڕی عەمر.[٢]

صەفییەی دایکی باوەڕداران بە ولاخێکەوە چوو تا بچێت بۆ لای عوثمان، کەچی ئەشتەر هاتە ڕێی و نەیهێشت، صەفییە وتی بمگێڕنەوە با ئەمە ئابڕووم

[١] - البداية و النهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٤٤.

[٢] - البداية و النهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٧٦.

نەبات، دواتر حەسەنی لە نێوان ماڵی خۆی و عوثماندا داناو خواردن و خواردنەوەی دەنارد بۆ عوثمان.[١]

لەو کاتەی عوثمانی کوڕی عەففان گەمارۆ درا، عەبدوڵای کوڕی زوبەیر هاودەم بە ئیبن عومەر و حەسەن و حوسەین و مەڕوان و ئەبووهورەیرە و ژمارەیەکی تر وەستان تا بەرگری بکەن لە خەلیفە، خەلیفەش سوێندی دان کە وازبهێنن و بچنەوە ماڵەوە،[٢] بەڵام عەبدوڵا و حەسەنی کوڕی عەلی و مەڕوانی کوڕی حەکەم نەچوونەوەو بەرگرییان کرد، عەبدوڵا چەندین شمشێر و تیری بەرکەوت و زۆر بریندار بوو، هەروەها حەسەنی کوڕی عەلی و مەروانیش بریندار بوون.[٣]

زەیدی کوڕی ثابت هات و وتی وا پشتیوانان لەبەردەرگان و دەڵێن ئەگەر دەتەوێت ئێمە دووبارە پشتیوانانی خواین، عوثمان وتی پێویستم بەوە نیە، دەست بگرنەوە-و مەجەنگن-،

ئەبووهورەیرە پێی وت ئەمڕۆ هاودەم بە تۆ دەمێنمەوە، عوثمان پێی وت تکام لێت هەیە-بڕیارم بۆت ئەوەیە- بچیتەدەرەوە-جێمبهێڵیت-،

١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٧٤١.

٢ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٨١.

٣ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٨٨.

حەسەنی کوڕی عەلی کۆتا کەس بوو کە لەلای مابوویەوە، چونکە حەسەن و حوسەین و ئیبن عومەر و ئیبن زوبەیر و مەڕوان هاتبوون بۆ لای، ئەویش زۆر جەختی لێکردنەوە چەکەکانیان دابنێن و بچنەدەرەوەو بچنەوە بۆماڵی خۆیان،

ئیبن زوبەیر و مەڕوان پێیان وت: ئێمە بڕیارمان لەسەر خۆمان داوەو وازناهێنین، عوثمانیش دەرگاکەی کردەوەو —لە راستترین گێڕانەوەدا هاتووە—چوونە ژوورەوە بۆ لای.[1]

ئاشووبگێڕان تەنانەت نەیاندەهێشت عوثمان ئاویش بخواتەوە، ئەو ئاوەی کە خۆی لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) بیرەکەی کڕیبوو بۆ موسڵمانان، عوثمان وتی ئادەی ئەو دوانەم بۆ بانگ بکەن کە هانتان دەدەن لە دژی من، ئەوانیش هاتن، عوثمان وتی سوێندتان دەدەم بە خوا دەزانن کە پێغەمبەر (ﷺ) هاتە مەدینە ئاوێکی سازگاری تێدا نەبوو جگە لە بیری رۆمە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (من يشتري بئر رومة فيجعل دلوه مع دلاء المسلمين بخير له منها في الجنة)، (هەرکەس بیری رۆمە بکرێت سەتڵی لەگەڵ سەتڵی موسڵماناندا بە چاکتر لە بەهەشت وەربگرێتەوە)، منیش لە سامانی خۆم کڕیم کەچی ئێستا تەنانەت ناهێڵن لە ئاوی دەریاش بخۆمەوە، وتیان بەڕێ وەڵا وایە، وتی سوێندتان دەدەم بە خوا دەزانن مزگەوت تەنگەبەر بووبوو بۆ موسڵمانان و

[1] -العواصم من القواصم.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (من يشتري بقعة آل فلان فيزيدها في المسجد بخير له منها في الجنة)، (کێ پارچە زەوی فلاّنە کەس دەکڕێت تا مزگەوتەکەی پێ فراوان بکات و لە بەهەشتدا لەوە چاکتری بۆ هەبێت)، منیش لە سامانی خۆم کڕیم کەچی ئەمڕۆ ناهێڵن دوو رکات نوێژی تێدا بکەم؟ وتیان بەڵێ بەخوا وایە، وتی سوێندتان دەدەم بە خوا دەزانن من لە سامانی خۆم سوپای عوسرە-تەبووك-م پڕچەك کرد؟ وتیان بەڵێ بەخوا وایە، وتی سوێندتان دەدەم بە خوا دەزانن پێغەمبەر (ﷺ) لە شاخی ثەبیرەوە دەیڕوانی بەسەر مەککەداو ئەبووبەکر و عومەرو منی لەگەڵ بوو، کە شاخەکە جوولا تا بەردی لێ کەوتە خوارەوە، پێغەمبەر (ﷺ) بە قاچی لێیدا و فەرمووی (دامرکێ ئەی ثەبیر پێغەمبەرێك و صدیقێك و دوو شەهیدت لەسەرە)؟ وتیان بەڵێ بەخوا وایە، ئەویش وتی الله اکبر سوێند بە خوای کەعبە شایەتیان بۆ دام کە من شەهیدم، سێ جار ئەوەی وت.[١]

لە کۆتا رۆژی ژیانیدا عوثمانی کوڕی عەففان بەڕۆژوو بوو، دەیوت خەوم دیوە بە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) کە فەرموویەتی ئەگەر دەست نەکەیتەوە بەرامبەر بەو هێرشبەرانە دەتکوژن و لای ئێمە رۆژوو دەکەیتەوە.[٢]

[١] - سنن الترمذي، الرقم ٣٧٢٣ و قال حديث حسن، حسنه الألباني في صحيح و ضعيف سنن الترمذي، الرقم ٣٧٠٣.

[٢] - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٨٣.

عوثمان ئەشتەری بانگ کرد و وتی ئەو خەڵکە چییان دەوێت؟ ئەویش وتی سێ شت، یان کارەکە بدەیتە دەست ئەوان چییان دەوێت بیکەن، یان خۆت بدەیت بە دەستەوە یان بتکوژن، عوثمان وتی بۆ وازهێنان جلێك داناکەنم کە خوا کردوویەتیە بەرم، بۆ خۆبەدەستەوەدانیش ئەگەر بمکوژن بەخوا دوای من یەکرِیزی نابیننەوە، لەو سەروبەندەدا کەسێك هات و دەرگاکەی کردەوە، موحەممەدی کوڕی ئەبووبەکر هاودەم بە سیانزە کەس هاتە ژوورەوە، موحەممەد ریشی عوثمانی گرت و توند رایکێشا و سەری بەرز کردەوە و دەیوت موعاویەو ئیبن عامیر و نامەکانت فریات ناکەون، ئەویش وتی برازا ریشم بەردە، موحەممەدیش ئاماژەی بۆ کەسێك کرد، کەسەکە هات و دای لە سەری، ئینجا کەوتنە کوشتنی،[1] بەڵام لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کە موحەممەد ریشی عوثمانی گرت، عوثمان وتی برازا ریشم بەردە، شوێنێکت گرتووم کە باوکت دەستی لێنەداوە، موحەممەدیش شەرم گرتی و کەناری گرت، خەڵکەکە هاتنە ژوورەوەو موحەممەد ویستی بەریان پێ بگرێت بەڵام نەیتوانی، ئیتر موحەممەد ماڵەکەی جێهێشت، کەسێك هات و بە دارێك دای لە سەری عوثمان و خوێن لە سەری دەچۆڕا، ئینجا کەوتنە لێدانی بە شمشێر، نائیلەی ژنی خۆی خستە بەردەمی و دەیقیژاند، کەچی دەستی ئەویش بەرکەوت و پەنجەکانی بڕان، چی شمەك لە ماڵەکەدا هەبوو هەموویان برد، سەری عوثمانیش لەولاوە کەوتبوویە

[1] - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٨٤.

لای قورئانەکەوە، کەسێك بە قاچی ددای لە سەری و لە قورئانەکە دووری خستەوە.[١]

شەهید کردنی ئیمامی عوسمان لە ڕۆژی هەینیدا بوو، لە ڕۆژی هەژدەی ذیلحیججەدا بوو، رایەك دەڵێت لە ڕۆژانی پاش جەژنی قوربان بوو، رایەکیش دەڵێت لە سێی مانگی ذیلحیججەدا بوو، بەڵام راستتر ئەوەیە لە هەژدەی مانگی ذیلحیججەدا بوو، تەمەنیشی هەشتاو دوو ساڵ تێپەڕی کردبوو، هەندێ دەڵێن هەشتاو دوو ساڵ و شەش مانگ، یان دەڵێن هەشتاو چوار ساڵ یان هەشتاو شەش یان هەشتاو هەشت یان نەوەد ساڵ بوو، هەریەك لە تەمەنی شەست و سێ ساڵی و حەفتاو پێنج ساڵیش هاتووە،[٢] ئیبن حەجەر دەڵێت راستترینیان ئەوەیە لە تەمەنی هەشتاو دوو ساڵ و شەش مانگیدا شەهید کرا.[٣]

سەبارەت بە شوێنی گۆڕەکەشی ئەوەیە کە لە ڕۆژهەڵاتی بەقیعەوە ئەسپەردە کراوە، رایەك دەڵێت تا سێ ڕۆژ تەرمەکەی ئەسپەردە نەکرا، رایەکیش دەڵێت تا دوو شەو، رایەکیش دەڵێت هەر یەکەم شەو ئەسپەردە کرا، ئەسپەردەکردنەکەی لەنێوان نوێژی ئێوارەو عیشادا بوو هاودەم بە ژمارەیەکی کەمی هاوەڵان کە حەکیمی کوڕی حیزام و زەیدی کوڕی ثابت و عەلی کوڕی ئەبووطالیب و زوبیەری کوڕی عەوام و کەعبی کوڕی مالیك و طەلحەی کوڕی

[١] - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٨٥.
[٢] - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٩٠-١٩١.
٣ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ٤٥٨.

عوبەیدوڵا و ژنەکانی عوثمانی تێدا بوو، شۆردرا و کفن کرا و نوێژی لەسەر کرا، هەندێ لە خەواریجەکان ڕێیان پێ دەگرتن و دەیانویست تەرمەکەی بەردباران بکەن و دواتر لە گۆڕستانی جوولەکەکان ئەسپەردە بکرێت تا عەلی کەسێکی نارد بۆ لایان و ڕێگری کرد لێیان، چەند جار هەوڵ درا ڕێ نەدەن لە گۆڕستانی بەقیعیش ئەسپەردە بکرێت، بۆیە لە دەرەوەی بەقیع ئەسپەردە کرا تا کاتێك موعاویە بوو بە خەلیفە ئەو دیوارەی نێوانی لابرد، دواتر تەرمی دوو خزمەتکارەکەی عوثمانیشیان هێنا کە کوژرابوون و لەپاڵ عوثماندا ئەسپەردە کران.[1]

کاتێك هەواڵی شەهیدبوونی عوثمان گەیشت بە عەلی کوڕی ئەبووطالیب، عەلی تەواو شڵەژا و هاودەم بە طەلحەو زوبەیر و سەعد چوون بۆ لای عوثمان و بینییان کوژراوە، عەلی تووڕە بوو لە حەسەن و حوسەین و وتی ئێوە لەبەر دەرگا بوون و هێشتتان ئەمیری باوەڕداران بکوژرێت؟! ئەوانیش وتیان ئێمە ئاگادار نەبوین بە کوژرانی، عەلی دەستی بەرزکردەوەو زللەیەکی دا لە حەسەن و دای بەسەر سنگی حوسەینیشدا، قسەشی وت بە موحەممەدی کوڕی طەلحەو عەبدوڵای کوڕی زوبەیر.[2]

---

[1] - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٩٠-١٩١.

[2] . الثقات لابن حبان، ج٢، ص ٢٦٥.

کاتێك سەعد هەواڵی کوژرانی عوثمانی بیست داوای لێخۆشبوونی لای خوا بۆ کرد و سۆزی بۆی جوولا و ئەم ئایەتەی خوێندەوە(﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا ﴿١٠٣﴾ الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا ﴿١٠٤﴾ **الكهف**: ١٠٣ – ١٠٤)، دواتر سەعد وتی خوایە پەشیمانیان بکەرەوەو دواتر لەناویان بەرە.[١]

رایەك دەڵێت کاتێك عوثمانی کوڕی عەففان شەهید کرا جوبەیری کوڕی موطعیم نوێژی لەسەر کرد، هەندێکیش دەڵێن حەکیمی کوڕی حیزام بووە، هەندێکیش دەڵێن میسوەری کوڕی مەخرەمە نوێژی لەسەر کرد.[٢]

١ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٨٩.

٢ - أسد الغابة، ج٣، ص ٦١٦.

## چوارەم: ماڵئاوایی عەلی کوڕی ئەبووتالیب (رضي الله عنه)

عەلی کوڕی ئەبووطالیبی کوڕی عەبدولموطەلیبی قورەیشی هاشمیە، کونیەکەی ئەبولحەسەنە.[١]

هاوسەرەکەری کە فاطیمەی کچی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵایە، کچی پێغەمبەری خوایە (ﷺ)،[٢] گەورەی ژنانی بەهەشت[٣] و دایکی دوو رەیحانە و خۆشەویستەکەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ)،[٤] یەکەم کەسی ناو بنەماڵەی پێغەمبەر (ﷺ) بوو کە دوای پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد.[٥]

ئیبن کەثیر سەبارەت بە ریزبەندی دەستەی یەکەمی موسڵمان بوان دەڵێت: دەکرێت لە کۆی هەموو گێڕانەوەکانەوە بڵێین یەکەم ئافرەت موسڵمان بوو خەدیجە بوو، یەکەم منداڵ موسڵمان بوو عەلی بوو، یەکەم خزمەتکار موسڵمان

---

١ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٩.

٢ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٩.

٣ - صحيح البخاري، الرقم ٣٤٤٦.

٤ - صحيح البخاري، الرقم ٣٥٦٤، صحيح ابن حبان، الرقم ٧٠٧٩، سنن الترمذي، الرقم ٣٧٨٨، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٨٢٥٨، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٥٧٥٣، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم ٥٦٠٦، مسند الطيالسي، الرقم ٢٠٢٥، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٢٨١٥.

٥ - صحيح البخاري، الرقم ٤١٧٩، صحيح مسلم، الرقم ٤٥٩٠.

بوو زەیدی کوڕی حارثە بوو، یەکەم پیاو موسڵمان بوو ئەبووبەکری صدیق بوو.[١]

عەلی کوڕی ئەبووتالیب باوکی رەیحانەکانی پێغەمبەری خوا و موژدەپێدراوی بەهەشت و خەلیفەی چوارەمی موسڵمانانە.

کاتێك فەتحی خەیبەر سەختی تێکەوت، بۆ شەوەکەی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (لأعطين الراية غدا رجلا يفتح على يديه، يحب الله ورسوله، ويحبه الله ورسوله)، (سبەینێ ئاڵاکە دەدەمە دەست کەسێك کە خوا لەسەر دەستی ئەو فەتحی خەیبەر دەبەخشێت، ئەو کەسە خواو پێغەمبەری خوای خۆش دەوێت و خوا و پێغەمبەری خواش (ﷺ) ئەویان خۆش دەوێت)، هەموو هاوەڵان هیوایان وابوو ئەوان بن، بۆ بەیانی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی عەلی لە کوێیە؟ وتیان ئازاری چاوی هەیە، پێغەمبەر (ﷺ) تفی دا لە چاوانی عەلی و نزای خێری بۆ کرد و عەلی چاك بوویەوە، ئینجا ئاڵاکەی دایە دەستی، ئینجا پێی فەرموو (انفذ على رسلك حتى تنزل بساحتهم، ثم ادعهم إلى الإسلام، وأخبرهم بما يجب عليهم، فوالله لأن يهدي الله بك رجلا خير لك من أن يكون لك حمر النعم)،[٢] (لەسەرخۆ هەنگاو بنێ تا دەچیتە لایان، دواتر بانگیان بکە بۆ ئیسلام و پێیان

١ - البداية و النهاية لابن كثير، ج٣، ص ٢٦.

٢ - صحيح البخاري، الرقم ٢٨٦٨، صحيح مسلم، الرقم ٤٥٢٧، صحيح ابن حبان، الرقم ٧٠٤٢، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٧٨٧٩، مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢٢٢١٥.

بڵێ چییان لەسەر پێویستە، جا بەخوا ئەگەر خوا بەهۆی تۆوە کەسێك رێنموونی بکات زۆر بۆت باشترە لە کۆمەڵە وشتری سوور).

لە ساڵی سی و چواری کۆچیەوە سەرەتاکانی فیتنە دەرکەوتن کاتێك دەستەیەك کەوتنە رەخنەگرتن لە عوثمانی کوڕی عەففان، سەرەتای رەخنەکەیان ئەوەبوو وتیان ئەو هاوەڵانێکی زۆری لە پۆستەکاندا لابردووەو کەسانی ئومەوی لە شوێنیاندا داناوە، ئەویش ئەو قسەی زۆر لا سەخت بوو و ناردی بە شوێن والی ناوچەکاندا و هەموو هاتن بۆ لای، لەوانە موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیان و عەمری کوڕی عاص و عەبدوڵای کوڕی سەعد و سەعیدی کوڕی عاص و عەبدوڵای کوڕی عامیر، لەو بارەوە رای ئەوانی وەرگرت، هەریەکەو رایەکی دەربڕی، عوثمانیش والیەکانی هێشتەوەو هەوڵیدا کەسە ناڕەزاکانیش بە جیهادەوە سەرقاڵ بکات، هۆکاری سەرەکی ئەم بەزمانەش کابرایەکی جوولەکە بوو بە ناوی عەبدوڵای کوڕی سەبە ءکە وای نیشان دابوو موسڵمان بووە، ئینجا چوویە میصر و لەوێ فیتنەیەکی نایەوەو گومانی بۆ خەڵکەکە دروست دەکرد، کورتەی وتەکەی ئەوەبوو پێغەمبەر (ﷺ) وەسیەتی کردووە بۆ عەلی کوڕی ئەبوو طالیب، بۆیە عەلی لە عوثمان شیاوترە بە دەسەڵات،[1] وەك ئەوەی ئەو هەموو هاوەڵەی دەوری پێغەمبەر (ﷺ) ئاگایان لە شتی وانەبووبێت و ئێستا کابرایەکی جوولەکەی تازە موسڵمان بوو کە ساتێکیش لە خزمەت پێغەمبەری

[1] - البداية و النهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٦٧-١٦٨.

خوادا (ﷺ) نەبووە ئەم مەسەلە گرنگەی زانیبێت، ئیتر تەنها ئەم لەسەر حەق و هەموو هاوەڵان یان نەزان یان فێڵباز بووبن.

ئیبن سەبەئی جوولەکە کەوتە تانەدان لە عوثمان و خۆی بە دڵسۆزی ئیسلام نیشان دا، خەڵکێکی زۆر بە قسەکانی هەڵخەڵەتان و کەوتنە شوێن راکانی و ئەو هەوڵەی خۆیان بە فەرمان بە چاکەو رێگری لەخراپە دەزانی، رۆژ بە رۆژ ئەو بیرەی سەبەئی بڵاو دەبوویەوە، تا دوای ساڵێك خەڵکەکە داوایان کرد لە عەلی کوڕی ئەبووطالیب بروات لەگەڵ عوثمان قسە بکات، عەلیش چوو و پێی وت: خەڵکێك لە دەرەوە سەبارەت بە تۆ منیان دواندووەو نازانم چی بڵێم، چی هەیە تۆ نەیزانیت و ئەوەی ئێمە دەیزانین تۆیش دەیزانیت، پێش تۆ نەکەوتوین تا شتێکت پێ بڵێین تۆ نەیزانیت، بە تەنیا لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) نەبوین تا شتیکی تایبەت بزانین و پێت بڵێین، شتێکی تایبەتمان بۆ نەبووە کە لە تۆشاراوە بێت، تۆ هاوەڵ و زاوای پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوویت و فەرموودەت لێوە بیستووەو بینیوتە، کوڕی ئەبووقوحافە و کوڕی خەططابیش لە تۆ لەپێشتر نەبون بە شتێك،تۆ لە خزمایەتیدا نزیکترینیت بە پێغەمبەر (ﷺ) و ئەوەی تۆ هەتبوو لە زاوایەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئەو دوانە نەیانبوو، لە هیچدا پێش تۆ نەکەوتن، دەی بۆ خاتری خوا وریای خۆت بە، نابینات پێ بینا ناکرێت و نەفامت پێ زانا ناکرێت، رێگەکە روونەو پایەکانی دین وەستاون، تۆ دەزانیت ئەی عوثمان چاکترین بەندەی خوا لای خوا پێشەوایەکی دادپەروەرە رێنموونی کرابێت و سوننەتێکی روون پەیرەو بکات و دوور لە بیدعەی دیار بگرێت، بەخوا

هەردووکیان رونن و سوننەتەکان وەستاو و بەرچاون و بیدعەکانیش هەروا، خراپترین کەس لای خوا پێشەوایەکی ستەمکاری گومڕایە کە خەڵکی بەهۆیەوە گومڕا ببن، ئیتر سوننەتی روون لەناوبەرێت و بیدعەی کەنارخراو زیندوو بکاتەوە، ...عوثمانیش وەڵامی دایەوەو وتی بەخوا دەمزانی ئەوە دەڵێیت، بەخوا ئەگەر تۆ لە شوێنی من بوویتایە، نە لێت تووڕە دەبووم و نە تانەم لێدەدایت و نە خراپەیەکم دەکرد، من خزمایەتیم گەیاندووەو درزەکانم گرتووەو پەنای فەوتاوم داوەو لەسەر هەمان شێوەی عومەر کەسەکانم داناوە، ئەی عەلی سوێندت دەدەم بە خوا دەزانیت ئایا موغیرەی کوری شوعبە لێرە نەبوو؟ وتی بەڵێ، وتی دەشزانیت عومەر داینا؟ وتی بەڵێ، عوثمان وتی دەی ئیدی بۆ سەرکۆنەی من دەکەن ئەگەر ئیبن عامیرم لەبەر خزمایەتی دانابێت؟ عەلی پێی وت عومەر کە کەسێکی دادەنا دواتر لاریەکی لێ بەدی بکردایە ئەوپەڕی سزای دەدا، بەڵام تۆ ئەوە ناکەیت، نەرمی و لاوازیت نواندووە بەرامبەر بە خزمانت، عوثمان وتی ئەوانە خزمانی تۆیشن، پاش برێك قسەکردن پێکەوە عەلی لای عوثمان چوویە دەرەوەو عوثمانیش بە دوایدا چوویە دەرەوەو چوویە سەر مینبەر و وتارێکی پێشکەش کرد.[1]

لە ساڵی سی و پێنجی کۆچیدا میصر شڵەژانێکی بەخۆوە دی، موحەممەدی کوڕی ئەبووبەکری صدیق و موحەممەدی کوڕی ئەبووحوذەیفەو ژمارەیەکی تر لە نەیارانی عوثمان نزیکەی شەش سەد سواریان لە میصرەوە ئامادە کرد و

---

[1] - البداية و النهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٦٨-١٦٩.

بەرێکەوتن بەرەو مەدینە و بوون بە چوار بەشەوە بە سەرکردایەتی عەمری کوڕی بودەیلی کوڕی وەرقائی خوزاعی و عەبدوڕەحمانی بەلوی و کینانەی کوڕی بیشر و سوودانی کوڕی حمران، موحەمەدی کوڕی ئەبووبەکریش لەگەڵیاندا هات، بەڵام موحەممەدی کوڕی ئەبووحوذەیفە لە میصر مایەوە تا خەڵکی تر هان بدات و بەرگری لەوانە بکات کە ڕۆیشتوون، والی میصریش نامەیەکی نووسی بۆ خەلیفەو ئاگاداری کردەوە لەو ڕووداوە و وتی وەك عومرەکار دێن و وا خۆیان نیشان دەدەن، کە لە مەدینە نزیك بوونەوە، خەلیفە فەرمانی کرد بە عەلی کوڕی ئەبووطالیب تا پێشهاتنیان بۆ مەدینە بیانگێڕێتەوە بۆ شوێنی خۆیان، عەلیش داوای لە عەمماری کوڕی یاسر کرد هاودەمی بکات، بەڵام عەممار ڕازی نەبوو، چونکە ئەویش تووڕە بوو لە عوثمان لەبەرئەوەی پێشتر عوثمانی کوڕی عەففان سزای دابوو، عەلی خۆی چوو بۆ لایان و لە ناوچەی جوحفە بوون، ئەوانە بە چاوی گەورەییەوە تەماشای عەلی کوڕی ئەبووطالیبیان دەکرد، عەلی لێیان تووڕە بوو و تەنانەت کەوتە قسە پێ وتنیان، ئەوانیش کەوتنە سەرکۆنەی خۆیان و وتیان لەسەر ئەمە جەنگی خەلیفە دەکەن؟ عەلی وتی بۆچی نەیاری عوثمانن؟ ئەوانیش چەند ڕەخنەیەکیان ژمارد، عەلیش یەك یەك وەڵامی ڕەخنەکانی ئەوانی دایەوە، دەستەیەکیشیان چوون گوێیان لە وتەکانی عوثمان گرت، کە هیچ ڕەخنەیەکیان نەما، دەستەیەك لە خەڵکی مەدینە داوایان لە عوثمان کرد سزای ئەوانە بدات، عوثمان لێبوردەیی نیشان دا، ئەوانیش گەڕانەوە و عەلیش گەڕایەوە بۆ لای عوثمان و

بەسەرهاتەکەی بۆ باسکرد و داوایشی لێکرد وتارێك پێشکەش بکات و پۆزش بهێنێتەوە بۆ ئەوەی خزمانی خۆی پێشخستووەو تەوبە نیشان بدات، عوثمانی‌ش راکەی وەرگرت و لە وتاری هەینیدا ئەوەی کرد و نزایەکی تەوبەی کرد و چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك و هەموو موسڵمانان گریان، ئینجا مەڕوانی کوڕی حەکەم وتەیەکی زبری پێشکەش کرد و دڵی عەلی رەنجاند، دواتر عوثمان بە راوێژی ژنەکەی ناردی بە شوێن عەلیدا تا بێت بۆ لای و ویستی دڵی بداتەوە، بەڵام عەلی رازی نەبوو، کە خەڵکی میصر بەم رووداوەیان زانی لەگەڵ خەڵکی کووفەو بەصرە کەوتنە نامە گۆڕینەوەو رێککەوتن لەسەر ئەوەی جەنگی عوثمان بکەن، لەو نێوەندەدا برێك نامە بەدەم هاوەڵانەوە ساختە کران، ئەوەبوو هەمدی شەش سەد سوار لە میصرەوە بە چوار بەش هاتن وئیبن سەبەئیشیان لەگەڵ بوو، لەو لاشەوە خەڵکی کووفە بە چوار بەش هاتن، خەڵکی بەصرەش بە چوار بەش هاتن، هەریەکەو نیازێکیان هەبوو، میصریەکان دەیانوت دەبێت عەلی ببێت بە خەلیفە، کووفیەکان دەیانوت با زوبەیر ببێت بە خەلیفە، بەصریەکان دەیانوت با طەلحە ببێت بە خەلیفە، هەموو لە مانگی شەووالدا لە دەوری مەدینە خڕ بوونەوە، میصریەکان چوون بۆ لای عەلی، ئەویش حەسەنی کوڕی ناردبوو بۆ لای عوثمان و خۆیشی کەناری گرتبوو، کە هاتن بۆ لای عەلی تووڕە بوو لێیان و دەری کردن، زوبەیر و طەلحەش بە هەمان شێوەی عەلی بانگەشەکەرانی خۆیانیان دەرکرد ونەفرەتیان لێکردن، ئینجا هەموویان نیازی خۆیان راگەیاند و وتیان داوای ئێمە ئەوەیە عوثمان واز لە

خیلافەت بهێنێت، جا میصریەکان دەیانوت جاری پێشوو کە چووینەتەوە نێردراوی عوثمانمان بەدیل گرتووە کە نامەی پێ بووەو نامەکە مۆری عوثمانی لەسەر بووەو تیایدا فەرمانی کردووە هەمووومان بکوژن و دەست و پێمان ببڕن، ئەو نامەشیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، کە عوثمان ئەوەی بیست سوێندی خوارد شتی وای نەوتووەو نەنووسیوە، ئەمەش نامەیەکی ساختە بوو ئامادە کرابوو، هەروەك نامە بە دەم عەلی و زوبەیر و طەلحەوە نووسرابوو کە بێن بۆ لەناوبردنی عوثمان، وەزعەکە بەو جۆرە بوو تا رۆژی هەینی هات و عوثمان وەك جاران وتاری خۆی پێشکەش کرد، هێندێ دوای ئەوە گەمارۆ درا.[1]

عوثمان پاش کۆتا وتاری لە هەینیدا، تووشی ژانەسەرێك بوو و لە هۆش خۆی چوو، خێرا بردیانەوە بۆ ماڵەوە، خێرا نەیارەکانی کە لەو شوێنە جیاوازنەوە هاتبوون، هاتن و گەمارۆی ماڵەکەیان دا، بەرامبەر بەوە خێرا دەستەیەك لە منداڵانی هاوەڵان بە فەرمانی باوکیان چوون بۆ ماڵی عوثمان تا بەرگری لە خەلیفە بکەن، لەوانە حەسەن و حوسەینی کوڕانی عەلی کوڕی ئەبوو طالیب، عەبدوڵای کوڕی زوبەیر و عەبدوڵای کوڕی عەمر.[2]

کاتێك هەواڵی شەهیدبوونی عوثمان گەیشت بە عەلی کوڕی ئەبووطالیب، عەلی تەواو شڵەژا و هاودەم بە طەلحەو زوبەیر و سەعد چوون بۆ لای عوثمان و بینییان کوژراوە، عەلی تووڕە بوو لە حەسەن و حوسەین و وتی ئێوە لەبەر

---

[1] - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٧٥.

[2] - البداية و النهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٧٦.

دەرگا بوون و هێشتتان ئەمیری باوەڕداران بکوژرێت؟! ئەوانیش وتیان ئێمە ئاگادار نەبوین بە کوژرانی، عەلی دەستی بەرزکردەوەو بۆگزێکی دا لە حەسەن و دای بەسەر سنگی حوسەینیشدا، قسەشی وت بە موحەممەدی کوڕی طەلحەو عەبدولڵای کوڕی زوبەیر.[1]

کاتێك عوثمان شەهید کرا دوای ئەوە بەیعەتی خیلافەت درا بە عەلی کوڕی ئەبوو طالیب، بەڵام سەردەمەکەی پڕ بوو لە ناڕەحەتی و ئەویش حەکیمانە بەرنگاری فیتنەو ناڕەحەتیەکان دەبوویەوە، بەڵام دواجار فیتنەکە زۆر لەوە گەورەتر بوو خەلیفە دەرەقەتی بێت.

یەکێك لەو فیتنانەی دەرکەوتن، بریتی بوو لە فیتنەی خەواریجەکان، ئیمامی عەلی بەرنگاریان بوویەوەو گورزی کوشندەی لێ وەشاندن، ئەوانیش بڕیاری تۆڵەسەندەوەیان دا و دواجاریش شەهیدیان کرد.

ئەمیری باوەڕداران عەلی بارێکی سەختی تووش بووبوو، لەلایەکەوە شپرزی سوپاکەی و لەلایەکی ترەوە سەرکەشی عێراقیەکان و لەولاوە کێشەی موعاویەو لەلایەکی تریشەوە بوونی خەواریجەکان، ئیتر عەلی وای لێهات بێزار بوو لە ژیان تا ئەوەی ئاواتی بە مەرگ دەخواست، هاوکات دڵنیا بوو لەوەی بە شەهیدی دەمرێت نەك بە مردنی ناو جێ، تەنانەت کە خەواریجەکان پێیان وت لەخوا

---

١ ٠ الثقات لابن حبان، ج٢، ص ٢٦٥.

بترسە تۆیش دەمریت، وتی نابەخوا نامرم بەڵکو ئەم ریشەم سوور دەبێت بە خوێن.[١]

سیّ کەس لە خەواریجەکان کە بریتی بوون لە ئیبنولمولجەم و بەرکی کوڕی عەبدوڵا و عەمری کوڕی بەکر کۆبوونەوەو باسی کوشتاری هاوڕێکانیان لە نەهرەوان کرد، بۆیە بڕیاری تۆڵەیان دا و ریککەوتن لەسەر ئەوەی هەرکامیان و یەکێك لە سەرکردەکان بکوژێت، ئیبنولمولجەم وتی من عەلی دەکوژم، بەرك وتی منیش موعاویە دەکوژم، عەمریش وتی منیش عەمری کوڕی عاص دەکوژم، ئەوەبوو هەرسێیان بەڵێنیان بە یەکدی دا و شمشێرەکانیان ژەهراوی کرد و وادەی حەڤدەی رەمەزانیان دانا، ئیبنولمولجەم چوو بۆ کووفەو خۆی شاردەوە لە خەواریجەکانی ئەویّ، جارێك یەکێك لە کچی خەواریجەکان کە ناوی قوطام بوو و باوك و برای لە نەهرەواندا کوژرابوون و ئافرەتێکی زۆر جوان بوو و چووبوویە مزگەوت و خۆی یەکلاکردبوویەوە بۆ پەرستش، ئیبنولمولجەم ئەم ئافرەتەی بینی و داوای کرد، بەڵام ئەو رازی نەبوو، تا دواجار سیّ مەرجی بۆ دانا، هەزار درهەم و خزمەتکارێك و رێی کوشتنی عەلی، ئەویش وتی دەی بەخوا بەس بۆ ئەوە هاتوومەتە ئەم شارە، ئەوەبوو مارەی کرد و گواستیەوە، قوطامیش بەردەوام هانی دەدا و کەس و پشتیوانیشی بۆ پەیدا کرد، ئەوەبوو لە کاتی دیاریکراودا ئیبنولمولجەم هاودەم بە دوو پشتیوانی کە (وەردان) و (شەبیب) بوون چوونە سەر رێی عەلی، کە عەلییان بینی خەڵکی بێدار

---

١ - البداية و النهاية لابن كثير، ج٧، ص ٣٢٤.

دەکردەوە بۆ نوێژ، شەبیب هەڵمەتی بۆ برد و شمشێرێکی لێدا، ئیبنلمولجەمیش شمشێرێکی لێدا و خوێن ریشی سوور کرد، ئینجا ئیبنولمولجەم دەیوت حوکم تەنها بۆ خوایە ئەی عەلی، نە بۆ تۆ و نە بۆ هاوەڵەکانت، عەلیش هاواری کرد بیگرن، وەردان رایکرد و کابرایەکی حەضرەمەوتی خۆی پێگەیاند و کوشتی، شەبیبیش رایکرد و رزگاری بوو، ئیبنولمولجەمیش گیرا، جەعدەی کوڕی هوبەیرە نوێژەکەی بەیانی بۆ خەڵکەکە کرد و عەلی برایەوە ماڵەوە، ئیبنولمولجەمیش برا بۆ لای، عەلی وتی ئەی دوژمنی خوا مەگەر من چاکەم لەگەڵ نەکردیت؟ وتی با، وتی ئەی بۆ واتکرد؟ وتی چل رۆژە ئەو شمشێرە ئامادە دەکەم و داوام لە خوا کرد خراپترین کەسی پێ بکوژێت، عەلی وتی خۆتیت بەوە دەکوژرێیت، تۆیش خراپترین کەسەکەیت، ئینجا وتی ئەگەر مردم ئەوە بیکوژن و ئەگەریش خۆم ژیام دەزانم چی پێ دەکەم، جوندوبی کوڕی عەبدوڵا وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران بەیعەت بدەین بە حەسەن؟ فەرمووی نە فەرمانتان پێ دەکەم و نە رێگریتان لێ دەکەم، خۆتان باشتر دەزانن، ئیتر بەردەوام دەیوت لا اله الا الله و هیچی تری نەدەوت.[1] ئەمەش ئاماژەیە بەوەی عەلی کوڕی ئەبوو طالیب راوێژی پێ رەوا بووە نەك دەسەڵاتی بنەماڵەیی و پشتاوپشتی.

پاشان عەلی هەریەك لە حەسەن و حوسەینی بانگ کرد و ئامۆژگاری کردن و وەسیەتی بۆ کردن تا لەخواترس بن و دنیا لەخشتەیان نەبات و قسەی حەق

١ - البداية و النهاية لابن كثير، ج٧، ص ٣٢٤-٣٢٨.

بڵێن و کار بکەن بۆ ڕۆژی دوایی و نەیاری ستەمکار و سەرخەری ستەملێکراو بن و کار بە قورئان بکەن و لەبەر خوا ترسیان لە لۆمەی لۆمەکاران نەبێت، ئینجا بە موحەممەدی کوڕیشی وت هەمان ئامۆژگاریشم بۆ تۆ هەیەو داواشم لێتە ڕێز لە براکانت بگریت چونکە مافیان بەسەرتەوە زۆرە، داوای کرد لە حەسەن و حوسەینیش چاك بن لەگەڵ موحەممەد چونکە برایانە و خۆشەویستی باوکیانە.، ئینجا ڕوویکردە حەسەن و وتی کوڕی خۆم وەسیەتت بۆ دەکەم لەخواترس بیت و نوێژەکان لە کاتی خۆیدا بکەیت و زەکات لە کاتی خۆیدا بدەیت و جوان دەستنوێژ بگریت چونکە نوێژ بە پاکی قبوولە، نوێژی زەکات نەدەر دروست نیە، لێبوردنت هەبێت بۆ تاوانکار و قین و تووڕەییت بخۆرەوەو پەیوەندی خزمایەتیت بەتین بکە و لەگەڵ نەزاناندا لەسەرخۆ بە و شارەزای ئایین بەو خۆراگربە لەسەر دینداری و پەیوەستی قورئان بەو دراوسێیەتیت چاك بێت و فەرمان بکە بە چاکەو ڕێگری بکە لە خراپە و دوور بە لە خراپەو داوێن پیسی.[١]

دوای وەسیەتەکەی یەك قسەی نەدەکرد جگە لە لا اله الا الله تا وەفاتی کرد.[٢]

---

١ - تاريخ الطبری، ج٣، ص ١٥٨.

٢ - البداية و النهاية لابن كثير، ج٧، ص ٣٢٩.

ئینجا کە عەلی وەفاتی کرد حەسەن هەستاو وتارێکی پێشکەش کرد بە خەڵکەکەو تیایدا وتی: دوێنێ کەسێك جێی هێشتن کە پێش خۆی و پاش خۆیشی هێندەی ئەو زانستیان نەبوو، پێغەمبەر (ﷺ) کە ئاڵای دەدایە دەست پشتی هەڵنەدەکرد تا ئەو شوێنەی فەتح دەکرد، جبریل لە لای راستیەوە بوو و میکائیل لە لای چەپیەوە بوو، تەنها شتێك پاش خۆی جێی هێشتبێت حەوت سەد درهەم بووە کە لە مووچەکەی پاشەکەوتی کردووە، دەیویست بەو پارەیە خزمەتکارێك بکڕێت،[1] شەوێك کوژرا کە تیایدا قورئان دابەزیوە، تیایدا عیسا بەرزکرایەوە، تیایدا مووسا گیانی سپارد)، حەسەن و حوسەین و عەبدوڵای کوڕی جەعفەر تەرمەکەی عەلییان شۆرد،[2] ئینجا حەسەن نوێژی لەسەر باوکی کرد.[3]

شەهیدکردنی عەلی لە شەوی حەڤدەی مانگی رەمەزانی ساڵی چلی کۆچیدا بوو، ماوەی خیلافەتەکەی چوار ساڵ و هەشت مانگ و نیو بوو.[4]

---

١ - صحيح ابن حبان، الرقم ٧٠٤٦، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٨١٣٧، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٦٥٦، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٧٥٠، مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ٣١٤٦٥، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٢٦٥١، حسنه الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة، الرقم ٢٤٩٦، كما حسنه شعيب الأرناؤوط،

٢ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٣٢٩.

٣ - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٦٣٦، سكت عنه الذهبي.

٤ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ٥٦٩.

## پێنجەم: مەرگی حەسەنی کوڕی عەلی (رضي الله عنه)

ئەم هاوەڵەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) یەکێکە لە خۆشەویستترین و نزیکترین و لێکچووترین و پایەدارترینی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەمە حەسەنی کوڕی عەلیە، کوڕی فاطیمەی کچی پێغەمبەری خوایە (ﷺ)، کوڕی ئامۆزای پێغەمبەر(ﷺ)، باوکی موژدەپێدراوی بەهەشت و چوارەم خەلیفەی موسڵمانانە، دایکی کچی پێغەمبەر(ﷺ) و گەورەی ژنانی بەهەشتە، باپیرەشی موحەممەدی پێغەمبەری خوایە، براکەی حوسەینی کوڕی عەلیە، حەسەن لێکچووترین کەسە بە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، رەیحانە خۆشەویستەکەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ)، ئەو منداڵە چاوگەشەیە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ماچی دەکرد، دەیگرتە کۆش، یاری بۆ دەکرد، خۆشی دەویست و دەیفەرموو من خۆشم دەوێت، خوایە تۆش خۆشت بوێت، ئەو لاوە خوێن گەرمە بوو کە لە دەوری هاوەڵاندا بوو، نزیك و خۆشەویستی خەلیفەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو، ئەو کەڵەپیاوەیە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) موژدەی دا دەبێتە هۆی چاککردنی نێوانی دوو دەستەی موسڵمانان، لە ئالوبەیتی پێغەمبەرە (ﷺ).

بەرائی کوڕی عازب دەڵێت پێغەمبەری خوام (ﷺ) بینی حەسەنی کوڕی عەلی لە قەلادۆشکان نابوو و دەیفەرموو (اللهم إني أحبه فأحبه)،[١] (خوایە من خۆشم دەوێت دەی تۆیش خۆشت بوێت).

ئەبووهورەیرە دەڵێت حەسەنی کوڕی عەلیم بینی لە ژوورەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بوو و پەنجەکانی دەکرد بە ناو ریشی پێغەمبەردا (ﷺ) و پێغەمبەریش (ﷺ) زمانی دەکرد بە دەمیدا، واتە زمانی حەسەنی دەکرد بە دەمی خۆیدا، ئینجا فەرمووی (خوایە من خۆشم دەوێت، دەی تۆیش خۆشت بوێت و ئەوەشت خۆش بوێت کە حەسەنی خۆش دەوێت).[٢]

ئەبی بەکرە دەڵێت رۆژێك پێغەمبەر(ﷺ) حەسەنی هێنا و لەگەڵ خۆی بردیە سەر مینبەر و فەرمووی (ابني هذا سيد و لعل الله أن يصلح به بين فئتين من المسلمين)،[٣] (ئەم کوڕەم سەییدەو هیوام وایە خوای گەورە بەهۆیەوە نێوانی دوو دەستەی موسڵمانان رێکبخات).

---

١ - صحيح البخاري، الرقم ٣٥٦٠، صحيح مسلم، الرقم ٤٥٥٢، صحيح ابن حبان، الرقم ٧٠٧٢، سنن الترمذي، الرقم ٣٨٠١، مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ٣١٥٥٣، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٨٢٠٩، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٢٥١٨.

٢ - معجم ابن الأعرابي، الرقم ١٣٢٦، معجم ابن المقرىء، الرقم ٦٣١.

٣ - صحيح البخاري، الرقم ٣٤٥٠ و اللفظ له، سنن أبي داود، الرقم ٤٠٦٤، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ١٦٩٩، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١١١٤٠، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٩٨٩١.

ئەبی سەعیدی خودری دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی (الحسن و الحسين سيدا شباب أهل الجنه)،[١] (حەسەن و حوسەین گەورەی گەنجانی بەهەشتن).

ئەگەر سەیر بکەین ژیانی حەسەن لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) یەکپارچە بریتی بووە لە وەرگرتنی ناز و خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ)، دەیگرتە کۆش، ماچی دەکرد، خۆشەویستی خۆی بۆ نیشان دەدا، نزای بۆ دەکرد، دەیخستە قەلادۆشکانی، زمانی دەمژی، لەگەڵ خۆیدا دەیبرد بۆ سەر مینبەر، لە نوێژدا کە دەچوویە سەر پشتی بە نەرمی سەری بەرز دەکردەوە،هتد...، چەندین بەسەرهات کە لە هەموویاندا خۆشەویستی خۆی بۆ حەسەن نیشان داوەو داوای کردووە خوا خۆشی بوێت و ئەوەشی خۆش بوێت کە حەسەنی خۆش دەوێت.

چەند شەوێکی کەم بەسەر وەفاتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) تێپەڕ بووبوو، ئەبووبەکری صدیق نوێژی عەسری کرد بۆ موسڵمانان، کە لێبوونەوە هاتەدەرەوەو عەلیش لەگەڵیدا بوو، دەرۆیشتن بە رێدا، ئەبووبەکر حەسەنی بینی کە لەگەڵ چەند منداڵێك یاری دەکرد، ئەبووبەکر حەسەنی گرتە

١ - السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٨٢٥٣، سنن الترمذي، الرقم ٣٧٨٦، مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ٣١٥٣٧، مسند احمد بن حنبل، الرقم ١٠٧٦٢، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم ١١٣٤، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٢٥٤٥، قال الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة، الرقم ٧٩٦، حديث حسن صحيح.

قەلادۆشکان و دەیوت لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەچێت نەك لە عەلی، عەلیش پێدەکەنی.[١]

پاش ئەوەی عەلی کوڕی ئەبووطالیب شەهید کرا، بەیعەتی خیلافەت درا بە حەسەنی کوڕی عەلی، حەسەنی کوڕی عەلی بڕیاریدا لەگەڵ موعاویەی کوڕی ئەبوو سوفیاندا ڕێکبکەوێت، ئەمەشی لە ناچاری و لاوازیدا نەکرد، بەڵکو تەنها لەپێناو کوژاندنەوەی فیتنەو ڕێکخستنی نێوان دوو دەستەی موسڵمانناندا بوو وەك چۆن پێغەمبەر(ﷺ) لە فەرموودەیەکدا ئاماژەی بەوە دابوو حەسەن کارێکی وا دەکات.

حەسەن تا دە ساڵ دوای ئەم ڕێککەوتنە ژیا

حەسەن ماوەی چل ڕۆژ نەخۆش بوو، دواتر لە مانگی ڕەبیعولئەوەل و لە تەمەنی چل و حەوت ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.[٢]

لە چەند سەرچاوەیەکدا هاتووە کە حەسەن ژەهرخوارد کراوەو بەهۆی ئەو ژەهرەوە مردووە، ئەوەتا ئیبن حەجەر هێناویەتی کە حەسەن لە سەرەمەرگیدا وتوویەتی من چەند جار ژەهرخوارد کراوم، بەڵام هیچکام وەك ئەم ژەهرەی ئەمجارە نەبوو، حوسەین هات بۆ لای و وتی کێ ژەهرخواردی کردیت؟ ئەویش

---

١ - مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٤٣ و اللفظ له، صحيح البخاري، الرقم ٣٣٧٠، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم ٣٣، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٢٤٦٤، دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ٢٣٩،

٢ - المنتظم لابن الجوزي، ج٥، ص ٢٢٦.

ئامادە نەبوو بڵێت کێیە،[1] ئەیوت بۆ چیتە؟ بۆ ئەوەی بیکوژیت؟حوسەین وتی بەڵێ، حەسەن وتی ئەگەر ئەو کەسە بێت کە گومانم بۆی ئەچێت ئەوە سزای خوا زۆر سەختترە، ئەگەریش ئەو نەبێت حەز ناکەم بە ناحەق بکوژرێت.[2]

یان گێڕانەوەیەکی تر هاتووە دەڵێت یەزیدی کوڕی موعاویە بە جەعدەی ژنی حەسەنی وت حەسەن ژەهرخوارد بکە با بمرێت، دواتر خۆم بەهاوسەرت دەگرم، کاتێك ئەوەی کرد و حەسەن مرد یەزید وتی ئێمە بۆ حەسەن تۆمان پێ باش نەبوو ئێستا بۆ خۆمان.[3]

ئیبن کەثیر دەڵێت بە رای من ئەو گێڕانەوە راست نیە، چ ئەوەی بە ناوی یەزیدەوە هاتووە کە وای کردبێت، چ ئەو گێڕانەوەی بە ناوی موعاویەوە هاتووە کە فەرمانی وای کردبێت.[4]

رایەکیش دەڵێت ژنەکەی ژەهری پێداوە لەبەر ئەوەی تەڵاق دراوە بۆیە وایکردووە.[5]

---

١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٧٣.

٢ - مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ٣٦٦٧٥.

٣ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٤٣.

٤ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٤٣.

٥ - المنتقى من منهاج الإعتدال لأبي عبدالله الذهبي، ج١، ص ٢٦٦

گێڕانەوەیەکی تر هاتووە کە موعاویە فەرمانی کردووە بە ئەشعەثی خەزووری حەسەن تا بە کچەکەی بڵێت حەسەن ژەهرخوارد بکات، ئیبن تەیمیەش وەڵامێکی یەکلاکەرەوەی دەداتەوەو دەڵێت: ئەشعەثی کوڕی قەیس لە ساڵی چلی کۆچیدا مردووە، بۆیە لە ڕێککەوتنی نێوان حەسەن و موعاویەدا (کە بە ساڵی کۆدەنگی ناوبراوە) ناوی نەهاتووە کە ئەویش ساڵی چل و یەکی کۆچیە، .. جا ئەگەر ئەو نزیکەی دە ساڵ پێش حەسەن کۆچی دوایی کردووە ئیتر چۆن ئەم فەرمانەی کرد بە کچەکەی،[1] بەم پێیە بێت دەبێت ئەشعەث لەناو گۆڕەکەیدا هەستابێتەوەو چووبێت بۆ لای کچەکەی و پێی وتبێت حەسەن ژەهرخوارد بکات، یان دەکرێت چووبێتە خەوی کچەکەی و پێی وتبێت!!!

ئیبنولعەرەبی سەبارەت بە ژەهرخواردکردنی حەسەن بە پیلانی یەزید دەڵێت: ئەمە لە دوو ڕووەوە ڕاست نیە، یەکەمیان ئەوەیە کە حەسەن ترسی لەسەر نەبوو چونکە خۆی دەسەڵاتی دابوویە دەست موعاویە، دووەمیش ئەوەیە کە ئەو مەسەلەیە غەیبە و بەس خوا دەیزانێت، ئیتر چۆن دەیدەنەوە پاڵ کەسێك.[2]

---

١ - المنتقى من منهاج الإعتدال لأبي عبدالله الذهبي، ج١، ص ٢٦٦.

٢ - العواصم من القواصم لابن العربي، تحقيق محب الدين الخطيب، ص ١٦٠.

ئیبن خەلدوونیش ئەو تۆمەتە بەرپەرچدەداتەوە کە دەڵێت موعاویە فەرمانی وایکردووەو دەڵێت ئەوە قسەلۆکی شیعەیە و موعاویە پاك و بەدوورە لە شتی وا.[١]

حەسەن پێش مردنی حوسەینی بانگ کرد و ئەم وەسیەتەی بۆ کرد:

(براکەم باوکمان بەر رەحمەتی خوا بکەوێت کە پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد خۆی بۆ ئەم بارە-دەسەڵات- دانابوو و هیوای وابوو بۆ ئەو بێت، ئەوەبوو خوا دووری گرت لێی و دایە دەست ئەبووبەکر، کە ئەبووبەکر سەرەمەرگی هات هەمدی حەزی پێکرد، ئەوەبوو هەمدی دوورخرایەوە لێی بەر عومەر کەوت، کە عومەر سەرەمەرگی هات کردی بە شوورا لە نێوان شەش کەسدا کە باوکمان یەکێك بوو لەوان، ئەوەبوو بەر عوثمان کەوت، کە عوثمانیش کوژرا بەیعەتی پێدرا، دوایی ململانێی لەگەڵ کرا تا شمشێری بۆ هەڵکرد و لەسەری جەنگا، بارەکە بۆی لەبار نەبوو و هیچی لێ دەست نەکەوت، سوێند بەخوا وانابینم خوای گەورە پێغەمبەرایەتی و خیلافەتیش لە ناو ئێمەی ئالوبەیتدا کۆبکاتەوە، وادەبینم هەرزەکانی کووفە تۆیش کەم دەگرن و دەرت دەکەن، من داوام لە عائیشە کردووە ئەگەر مردم مۆڵەتم بدات لە ماڵەکەی ئەودا لەلای پێغەمبەر(ﷺ) ئەسپەردە بکرێم، ئەویش رازی بووە، دەڵێم لەوانەیە لە شەرمدا وتبێتی بەڵێ و رازی بووبێت، بۆیە ئەگەر مردم برۆ بۆ لای و داوای هەمان شتی لێ بکەرەوە، ئەگەر پێی خۆش بوو ئەوە لە ماڵەکەی ئەودا ئەسپەردەم بکە،

---

١ - تاريخ ابن خلدون، ط٥، دار القلم (بيروت- ١٩٨٤)، ج٢، ص ٦٤٩.

گومانم زۆرە خەڵكێك نەهێڵن ئەوە بكەیت، جا ئەگەر رێگرییان لێكردیت ئەوا لێیان مەپاڕێرەوەو لەسەری مەڕۆ و لە بەقیع ئەسپەردەم بكە، چونكە لەوێش كەسانی پێشەنگی لێیە).[١]

ئینجا كە حاڵی سەخت بوو وتی بمبەنە دەرەوە با ئاسمانم لێوە دیار بێت، بردیانە دەرەوە، سەیرێكی ئاسمانی كرد و وتی خوایە من لای تۆ چاوەڕێی پاداشتم.[٢]

حوسەینی برای بەسەرسەریەوە بوو، حوسەینیش بە دڵگرانیەوە ئەیوت برا ئازیزەكەم خۆ تۆ وا دەچیت بەرەو لای پێغەمبەر(ﷺ)-باپیرەمان- و عەلی -باوكمان- و خەدیجە-ی داپیرەمان- و فاتیمە-ی دایكمان- و قاسمو طاهیری خاڵوانت و حەمزەو جەعفەری مامت، حەسەنیش پێی وت ئای برا ئازیزەكەم، وا دەچمە حاڵێكەوە كە خوا دایناوە هیچكات حاڵی لەو جۆرەم نەدیوە، برێ دروستكراوی خوا ئەبینم كە هیچكات شێوەی وەك ئەوانەم نەدیوە، ئیتر حوسەین خۆی پێ رانەگیرا و دەستی كرد بە گریان.[٣]

---

١ - الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٣٩١-٣٩٢.

٢ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٤٣.

٣ - تأريخ دمشق، ج١٣، ص ٢٨٦.

حەسەنی کوڕی عەلی لەساڵی چل و نۆی کۆچیدا وەفاتی کرد، بۆچوونێ دەڵێت لە ساڵی پەنجاو یەکی کۆچیدا بووە،[١] رایەکیش دەڵێت لە ساڵی پەنجای کۆچیدا وەفاتی کردووە،[٢] ئیبن کەثیر دەڵێت رای راستتر ئەوەیە لە ساڵی چل و نۆی کۆچیدا وەفاتی کردووە،[٣] هەروەك ئیبن خەلدوونیش هەمان رای هەیە.[٤]

حەسەن داوای کردبوو لەلای پێغەمبەر(ﷺ) ئەسپەردە بکرێت ئەگەر هاتوو عائیشە رازی بوو، ئەگەریش خەڵکەکە رێگر بوون ئەوا با لە بەقیع ئەسپەردەی بکات و لەسەر مەسەلەکە نەڕوات، بۆیە کاتێك حەسەن مرد، لەسەر وەسیەتی خۆی حوسەین چوو بۆ لای عائیشەو داوای لێکردەوە کە حەسەنی برای لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەسپەردە بکرێت، ئەویش رازی بوو و وتی باشە، بەڵام مەڕوان کە ئەمەی بیست وتی سوێند بەخوا نابێت حەسەن لەوێ ئەسپەردە بکرێت، نەیانهێشت عوثمان لەوێ ئەسپەردە بکرێت و ئێستا ئەمان دەیانەوێت حەسەن لەوێ ئەسپەردە بکەن؟ کە حوسەینیش ئەم قسەی بیست بە چەکەوە هاودەم بە چەند کەسێکی تر چوو، مەڕوانیش خۆی ئامادە کرد، کە ئەبووهورەیرە بیستی بارەکە گەیشتوەتە ئەوە، وتی سوێند بەخوا ئەوە ستەمێکە لە حەسەن

---

١ - تاريخ ابن خلدون، ج٢، ص ٦٤٩.

٢ - المنتظم لابن الجوزي، ج٥، ص ٢٢٦.

٣ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٤٥.

٤ - تاريخ ابن خلدون، ج٢، ص ٦٤٩.

دەکرێت، دەبێت ڕێ بدرێت لەگەڵ باوکیدا (واتە مەبەستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو) کفن بکرێت، ئەو کچەزای پێغەمبەرە (ﷺ)، ئینجا چوو بۆ لای حوسەین و قسەی لەگەڵ کرد و سوێندی دا وازبهێنێت، وتی مەگەر براکەت نەیوت ئەگەر زانیت جەنگی لێدەکەوێتەوە ئەوا بمبەنەوە بۆ گۆڕستانی موسڵمانان؟ زۆر لێی پاڕایەوە تا حوسەین ڕازی بوو و حەسەنیان برد لە گۆڕستانی بەقیع ئەسپەردەی بکەن، حوسەین حەزی دەکرد خۆی نوێژی مردوو لەسەر تەرمی حەسەنی برای کرد، بەڵام سەعیدی کوڕی عاصی والی مەدینەی پێش خست و وتی ئەگەر سوننەت نەبوایە تۆم ڕانەدەسپارد بۆ ئەو بەرنوێژیە، سەعیدی کوڕی عاصیش کە ئەمیری مەدینە بوو ئامادەی مەراسیمی نوێژ و ئەسپەردەکردنی تەرمی حەسەن بوو، هەروەها خالیدی کوڕی وەلیدیش ئامادەی مەراسیمی ئەسپەردەکردنەکەی بوو، گۆڕەکەی حەسەن لەپاڵ گۆڕی فاطیمەی دایکیدا بوو.[١]

١ - الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٣٩٢.

## شەشەم: ماڵئاوایی حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب (رضي الله عنه)

حەمزەی کوڕی عەبدولموطەلیب مام و برای شیری پێغەمبەر (ﷺ) و گەورەی شەهیدانە،[١] پێشەوای پاڵەوان و شێری خوا، لە هاشمیەکان.[٢]

حەمزە لە ساڵی دووەمی پێغەمبەرایەتیدا موسڵمان بوو،[٣] کۆچی کرد بۆ مەدینە و لەوێ لە جەنگی بەدردا بەشداری کرد و رۆڵێکی گەورەی تێدا بینی،[٤] دواتریش لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد و تیایدا شەهید بوو.

لە جەنگی ئوحوددا حەمزە لە بەردەم پێغەمبەردا (ﷺ) بوو و بە دوو شمشێرەوە دەجەنگا و دەیوت من شێری خوام،[٥] دەچووە پێش پێغەمبەر (ﷺ) و پشت پێغەمبەر(ﷺ) و دەجەنگا،[٦] خوای گەورە لەسەر دەستی حەمزە سی و یەك بێباوەڕی لەناو برد.[٧]

---

١ - أسد الغابة، ج٢، ص ٦٦.

٢ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ١٧٢.

٣ - أسد الغابة، ج٢، ص ٦٦.

٤ - أسد الغابة، ج٢، ص ٦٧.

٥ - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٨٢٨، صححه الذهبي في التلخيص.

٦ - مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ٣٦٠٦٦.

٧ - الآحاد و المثاني لابن أبي عاصم، الرقم ٢٣٧٤، مسند الشاميين للطبراني، الرقم ١١٤٧، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٧١٥.

کۆیلەیەك بە ناوی وەحشی حەمزەی شەهید کرد،[١] وەحشی دەڵێت من لای جوبەیری کوڕی موطعیم بووم، جا جوبەیر لە غەزای بەدردا مامی کوژرابوو، پێی وتم ئەگەر مامی موحەممەد بکوژیت ئەوە ئازادت دەکەم، ئەوەبوو لە رۆژی جەنگی ئوحوددا منیش چووم بۆ جەنگ، سیباع وتی کەس هەیە جەنگی بەرامبەریم لەگەڵ بکات؟ حەمزە هات بۆی و قسەیەکی ناشیرینی وت بە سیباع و وتی ئایا دژایەتی خواو پێغەمبەری خوا دەکەیت؟ ئینجا هەڵیکوتایە سەری،[٢] تاکە خەم و خەیاڵم ئەوە بوو ئازاد ببم، بۆیە چاوم لەسەر حەمزە بوو،[٣] لە پشت بەردێکەوە خۆم بۆ مەڵاس دا تا دەرفەتی چاکم دەست کەوت و بە رمەکەم لێمدا و دام لە ورگی،[٤] حەمزە هەوڵیدەدا هەستێتەوە بەڵام نەیتوانی و کەوت، منیش گەڕامەوە بۆ مەککەو ئازاد کرام، ئینجا کە فەتحی مەککە کرا منیش چووم بۆ طائیف و لەوێ مامەوە، کاتێك خەڵکی مەککە رێککەوتنیان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) کرد بارم سەخت بوو و دەموت باشە مل بۆ کوێ بنێم؟ لەو خەمەدا بووم کە کەسێك منی بینی و وتی چیە وا خەمبار دەتبینم؟ منیش وتم وەڵا من مامی موحەممەدم کوشتووەو وا دەبینم ئەم خەڵکەش لەگەڵی

---

١ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ٤٢.

٢ - صحيح البخاري، الرقم ٣٨٦٢، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٥٧٥٩.

٣ - المعجم الكبير للطبراني، الرقم٢٨٧٨، مسند الطيالسي، الرقم ١٣٩٦، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٦٩١.

٤ - صحيح البخاري، الرقم ٣٨٦٢، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٥٧٥٩.

ڕێککەوتون و نازانم بەرەو کوێ ڕاکەم؟ ئەویش وتی بەخاو هەرکەس بچێت بۆ لای و شایەتومان بهێنێت ئەو نایکوژێت، منیش خێرا چوومە مەدینەو چوومە بەردەمی و بە پێوە وەستابووم و ئەویش دانیشتبوو، سەری بەرز کردەوەو فەرمووی تۆ وەحشیت؟ وتم بەڵێ، ئینجا شایەتومانم هێنا،[1] فەرمووی تۆ حەمزەت کوشت؟ وتم مەسەلەکە وایە کە بیستووتە؟[2] ئینجا فەرمووی ئادەی بۆم باس بکە چۆن حەمزەت کوشت ماڵ وێران؟ منیش بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە،[3] پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی (فهل تستطيع أن تغيب عني وجهك)،( دەی ئەتوانیت دەموچاوتم لێ دوور بگریت)، منیش خۆم دوور دەگرت لە پێغەمبەر(ﷺ) تا وەفاتی کرد، ئینجا کە سەردەمی ئەبووبەکر هات و سوپای نارد بۆ یەمامە، منیش وتم ئەچم تا موسەیلەمە بکوژم بەوە حەقی کوشتنەکەی حەمزە بکەمەوە،[4] لەگەڵ خەڵکەکە چووم و موسەیلەمەم کردە چاو،[5] بینیم کەسێك لای کەلەبەرێکی دیوارێك وەستاوەو دەڵێیت وشترە رەشەیەکی پرچ بڵاوە،[6] لەگەڵ یەکێك لە پشتیوانان هەڵمانکوتایە سەری و بە هەمان ئەو رمەی

١ - المعجم الكبير للطبراني، الرقم٢٨٧٨، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٦٩١٥.

٢ - صحيح البخاري، الرقم ٣٨٦٢، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٥٧٥٩.

٣ - المعجم الكبير للطبراني، الرقم٢٨٧٨، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٦٩١٥.

٤ - صحيح البخاري، الرقم ٣٨٦٢، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٥٧٥٩.

٥ - المعجم الكبير للطبراني، الرقم٢٨٧٨، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٦٩١٥.

٦ - صحيح البخاري، الرقم ٣٨٦٢، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٥٧٥٩.

کە حەمزەم پێ کوشتبوو دام لە موسەیلەمە،[١] رمەکەم دا لە نێوەندی مەمکەکانی و لە پشتەوە رمەکە دەرچوو، پشتیوانیەکەش بە شمشێر لێیداو دای لە سەری،[٢] ئیتر خوا زاناترە کاممان کوشتمان، ئەگەر من کوشتبێتم ئەوە چاکترین کەس و خراپترین کەسیشم کوشتون[٣](واتە حەمزەو موسەیلەمە).

وەحشی کاتێك لە جەنگی ئوحوددا تەرمەکەی حەمزەی بینی چوو بە رمێك یان بە خەنجەرێك سکی حەمزەی هەڵدڕی،[٤] ئینجا جەرگی حەمزەی هەڵگرت و بردی بۆ هیند، چونکە ئەو ئافرەتە هەر لە کاتی کوژرانی باوکیەوە لە جەنگی بەدردا بە دەستی حەمزە نەزری کردبوو جەرگی حەمزەی دەست بکەوێت.،[٥] ئەوەبوو کە جەرگەکە کەوتە دەست هیند، هیند جەرگەکەی جوی و دواتر تفیەوە، ئینجا هاتە لای تەرمەکەی حەمزەو تەرمەکەی زیاتر شێواند.[٦]

کوژرانەکەی حەمزەش لە رۆژی شەممەو لە نیوەی مانگی شەوالدا بوو.[٧]

---

١ - المعجم الكبير للطبراني، الرقم٢٨٧٨، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٦٩١٥.

٢ - صحيح البخاري، الرقم ٣٨٦٢، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٥٧٥٩.

٣ - المعجم الكبير للطبراني، الرقم٢٨٧٨، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٦٩١٥.

٤ - مصنف إبن أبي شيبة، الرقم ٣٦٠٦٦.

٥ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ١٧٩.

٦ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٠.

٧ - أسد الغابة، ج٢، ص ٦٨.

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) چوویە سەر تەرمەکەی حەمزەو بینی چی لێهاتووە و چۆن تەرمەکەی شێوێنراوە، فەرمووی (لولا أن تجد صفية في نفسها لتركته حتى تأكله العافية حتى يحشر من بطونها)،[1] (ئەگەر دڵی صەفیە بەرگەی بگرتایەو پێی دڵتەنگ نەبوایە بە دڵنیاییەوە تەرمەکەیم وا جێدەهێشت تا گۆشت خۆرەکان بیانخواردایە تا لە رۆژی دواییدا لەناو سکی ئەواندا حەشر بکرایە)، ئەوەبوو لە پێستی پڵنگێکدا کفنی کرد،[2] هێندە کەم بوو کە کاتێك سەری پێ دادەپۆشی قاچەکانی دەردەکەوتن و کاتێکیش قاچەکانی دادەپۆشی سەری دەردەکەوت،[3] ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی سەری داپۆشن و قاچەکانیشی بە گوژاڵك داپۆشن، ئەو رۆژە جل و بەرگ کەم بوو و کوژراویش زۆر بوو، بۆیە کەس و دوو کەس و سێ کەس لە یەك بەرگدا کفن دەکران.[4]

---

١ - سنن أبي داود، الرقم ٢٧٤٥، سنن الترمذي، الرقم ٩٧٣، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٢٠٥٨،

٢ - المستدرك على الصحيحين، قال الذهبي صحيح على شرط مسلم، كما صححه الألباني.

٣ - المستدرك على الصحيحين، الرقم ١٢٨٥، مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ٣٦٠٦٨.\، سنن الدارقطني، الرقم ٣٦٨٢، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٢٠٥٨، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٢٨٧٠، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن الترمذي، الرقم ١٠١٦.

٤ - مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ٣٦٠٦٨، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن الترمذي، الرقم ١٠١٦.

پێغەمبەر(ﷺ) کە تەرمی حەمزەی بینی وا شێوێنرا بوو، فەرمووی (ئەگەر سەرکەوم بەسەر قورەیشدا بە دڵنیاییەوە تەرمی سی دانەیان دەشێوێنم)،[١] هاوەڵانیش کە بینییان پێغەمبەر(ﷺ) چەندە دڵگرانە، دەیانوت ئەگەر سەرکەوین بەسەریاندا وا تەرمیان دەشێوێنین هیچ عەرەبێك شتی وای نەکردبێت،[٢] ئەوەبوو خوای گەورە ئایەتی دابەزاندە خوارەوە (وإن عاقبتم فعاقبوا بمثل ما عوقبتم به).[٣]

صەفییەی خوشکی حەمزە گەیشت بە عەلی و زوبەیر و هەواڵی حەمزەی پرسی لێیان، ئەوانیش وایان نیشاندا کە هەواڵی نازانن، صەفییە چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش فەرمووی (من دەترسم صەفیە عەقڵی لەدەست بدات) بۆیە دەستی خستە سەر سنگی صەفییە و نزای بۆ کرد و داوای کرد بگەڕێتەوە، صەفییەش دەگریا.[٤]

---

١ - سنن الدارقطني، الرقم ٣٦٨١، وفيه عبد العزيز بن عمران و هو ضعيف، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٠٨٤١.

٢ - دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ١١٦٣.

٣ - سنن الدارقطني، الرقم ٣٦٨١، وفيه عبد العزيز بن عمران و هو ضعيف، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٠٨٤١.

٤ - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٨٤٨، قال الذهبي سمعه أبوبكر بن عياش من يزيد و هما ليسا بمعتمدين.

صەفییە کە هات دوو جلی حەمزەی پێ بوو، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) صەفییەی بینی حەزی نەکرد صەفییە حەمزە بەو شێوازە ببینێت، بۆیە زوبەیری نارد تا رێ نەدات حەمزە ببینێت، کاتێك زوبەیر گەیشتە لای صەفییە وتی دایە گیان راوەستە، ئەویش وتی لەسەر رێم لاچۆ، کاتێك بینی صەفییە واز ناهێنێت وتی پێغەمبەر(ﷺ) منی نارد بۆ لات، صەفییە کە ئەوەی بیست خێرا وەستا و دوو جلەکەی گرتە دەست و جلێکیان بۆ کفنی حەمزە بوو و ئەوی تریشیان بۆ کفنی پشتیوانییەك بوو.[١]

پێغەمبەری خوا (ﷺ) نازناوی شێری خوا و گەورەی شەهیدانی بەهەشتیشی لێناوە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت (سید الشهداء حمزة بن عبدالمطلب و رجل قام إلى إمام جائر فأمره و نهاه فقتله)،[٢] (گەورەی شەهیدان حەمزەی کوڕی عەبدولموطەلیبە، هەروەها پیاوێك کە بچێتە لای دەسەڵاتدارێکی ستەمکار و فەرمان بە چاکەو رێگری لە خراپەی لێ بکات و دەسەڵاتدارەکەش ئەو پیاوە بکوژێت).

سەبارەت بەوەی ئایا نوێژی لەسەر کراوە، هەرچەندە بڕێ دەق هاتووە کە حەمزە نوێژی لەسەر کراوەو لەلایەن هاوەڵانەوە حەفتا جار نوێژی لەسەر

١ - دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ١١٧٠.

٢ - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٨٣٧، المعجم الأوسط للطبراني، الرقم ٤١٧٢، صححه الألباني في سلسلة الاحاديث الصحيحة، الرقم ٣٧٤، لكن ضعفه الذهبي في سير أعلام النبلاء، ج١، ص ١٧٣.

کراوە، بەڵام بە پێی گێڕانەوەی صەحیح کە لە بوخاریدا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) بە هەموو شەهیدانی ئوحودی فەرمووو (من لە ڕۆژی دواییدا شایەتم بۆ ئەمانە) بۆیە فەرمانی کرد بە خوێنەکەیانەوە ئەسپەردە بکرێن و نەشۆردرێن و نوێژیشیان لەسەر نەکرا.[١]

هەریەك لە حەمزەو عەبدوڵای خوشکەزای (عەبدوڵای کوڕی جەحش) لە یەك گۆڕدا ئەسپەردە کران.[٢]

هەریەك لە ئەبووبەکر و عومەر و عەلی و زوبەیر دابەزینە ناو گۆڕەکەو پێغەمبەریش (ﷺ) لە لێواری گۆڕەکەدا دانیشتبوو.[٣]

---

١ - صحيح البخاري، الرقم ١٢٩١، صحيح ابن حبان، الرقم ٣٢٥٦، سنن ابن ماجة، الرقم ١٥٠٩، سنن الترمذي، الرقم ٩٩٣، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٢٠٥٨، سنن الدارقطني، الرقم ٣٦٨٥، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ٦٤٠٨.

٢ - أسد الغابة، ج٢، ص ٧٠.

٣ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٠.

## حەوتەم: ماڵئاوایی عائیشەی کچی ئەبووبەکر (رضي الله عنها)

عائیشەی کچی ئەبووبەکری صدیق، باوکی یەکێکە لە نزیکترین هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و موژدەپێدراوی بەهەشت و یەکەم خەلیفەی موسڵمانان.

عائیشە زاناترینی نێو ئافرەتانی ئوممەتی ئیسلامە.[١]

دوای وەفاتی خەدیجە، پێغەمبەر (ﷺ) سەودەی بە هاوسەر گرت و ماوەیەك تەنها سەودە خێزانی بوو، ئینجا عائیشەی بەهاوسەرگرت.[٢]

عائیشە دەڵێت جارێك لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) پێشبڕکێمان کرد، من لێم بردەوە، دوای ماوەیەك قەڵەو بووم، هەمدی پێشبڕکێمان کرد و پێغەمبەر (ﷺ) لێی بردمەوەو فەرمووی ئەمەیان بەوی تر.[٣]

عائیشە دەڵێت جارێك پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرمووم (إني لأعلم إذا كنت عني راضية، وإذا كنت علي غضبى)، (من دەزانم تۆ کەی لێم رازیت و کەی لێم تووڕەیت) منیش وتم چۆن دەزانیت؟ فەرمووی (أما إذا كنت عني راضية، فإنك تقولين لا ورب محمد، وإذا كنت علي غضبى قلت لا ورب إبراهيم)، (ئەگەر لێم

---

[١] - سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص ١٣٥.

٢ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٦٥.

[٣] - صحيح ابن حبان، الرقم ٤٧٦٤، سنن أبي داود، الرقم ٢٢٧، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٨٦٦٩، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٥٧٠٤، صححه شعيب الأرناؤوط، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داود، الرقم ٢٥٧٨.

رازی بیت دەڵێیت نا بە خوای موحەممەد، ئەگەریش لێم تووڕە بیت دەڵێیت نا بەخوای ئیبراهیم)، منیش وتم بەڵێ بەخوا وایە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ).[١]

هاوەڵان دەیانزانی پێغەمبەر (ﷺ) چەندە عائیشەی خۆشدەوێت، بۆیە هەرکات بیانویستبا دیاریەکی بۆ ببەن، دەوەستان تا بچێت بۆ ماڵی عائیشە ئینجا دیاریەکەیان بۆ دەبرد.[٢]

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) نەخۆش کەوت دەیفەرموو (أين أنا غدا؟)، (سبەی لە ماڵی کام هاوسەرمم؟) چونکە حەزی دەکرد لە ماڵی عائیشە بێت، ئەوەبوو هاوسەرەکانی تری مۆڵەتیان دا تا کام ماڵی پیێ خۆشە لەویێ بمێنێتەوە، ئەوەبوو پێغەمبەر (ﷺ) لە ماڵی عائیشە مایەوە تا وەفاتی کرد.[٣]

کاتێك عائیشە لە سەرەمەرگدا بوو، ئیبن عەبباس هات بۆ لای، عائیشە وتی دواجار هاتیت؟ عەبدولای برازایشی لەلای سەریەوە بوو، وتی ئەوە ئیبن عەبباسەو داوای مۆڵەت دەکات، عائیشە وتی وازم لیێ بێنە پێویستم بە هاتن و تەزکیەی ئەو نیە، عەبدولا وتی دایە گیان ئیبن عەبباس لە کوڕە چاکەکانتەو هاتووە بۆ ماڵئاوایی و سەلام لێکردنت، ئەویش وتی ئەگەر حەز دەکەیت

---

[١] - صحيح البخاري، الرقم ٤٩٣٣، صحيح مسلم، الرقم ٤٥٧٣، صحيح ابن حبان، الرقم ٧٢١٩، مسندأحمد بن حنبل، الرقم ٢٣٧٦٠.

[٢] - صحيح البخاري، الرقم ٢٤٦٢، سنن الترمذي، الرقم ٣٨٩٦، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٨٦٢٤، قال الذهبي في سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١٤٣ متفق على صحته.

[٣] - صحيح البخاري، الرقم ٤١٩٤.

مۆڵەتی بدە، ئیبن عەبباس هات و دانیشت و وتی موژدەت لێ بێت، بەخوا تەنها دەرچوونی رۆحت لە جەستەت رێگرە لە گەیشتنت بە موحەممەد و ئازیزان، ئەویش وتی وایە ئیبن عەبباس، ئیبن عەبباس وتی تۆ خۆشەویستترین هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) بووی لا پێغەمبەر (ﷺ)، ئەویش تەنها کەسی پاکی خۆشدەویست، ئینجا بەسەرهاتی دابەزینی ئایەتی تەیەمومەکەی بۆ گێڕایەوە، ئینجا وتی دواتر خوای گەورە ئایەتی تایبەت بە پاکی تۆی دابەزاند و لەوسا بەدوا چی مزگەوتێ یادی خوای تێدا بکرێت تیایدا پاکی تۆیش باس دەکرێت، عائیشە وتی وازم لێ بێنە ئیبن عەبباس خۆزگە باسم ببڕایەتەوەو ناوم لەناوانا نەبوایە.[1]

لە سەرەمەرگیدا بوو کە داخی رووداوی جەمەلی لەیاد نەدەچوو چی کردووە، بۆیە وتی من دامنابو لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) لە ماڵی خۆمدا ئەسپەردە بکرێم، بەڵام دوای وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) بەزمم سازاند، بۆیە بمبەن لەگەڵ هاوسەرەکانی تری پێغەمبەر (ﷺ) ئەسپەردەم بکەن، ئیتر برا لە بەقیع ئەسپەردە کرا.[2]

کاتێك وەفاتی کرد ئەبووهورەیرە نوێژی لە سەر تەرمەکەی کرد و دواتر تەرمەکەی لە بەقیع ئەسپەردە کرا.[3]

---

[1] - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١٨٠.

[2] - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١٩٣.

[3] - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١٩٢.

هەریەك لە عەبدوڵای كوڕی زوبەیر و عوروەی كوڕی زوبەیر كە خوشكەزای بوون و قاسم و عەبدوڵای كوڕانی موحەممەد كە برازای بوون و عەبدوڵای كوڕی عەبدوڕەحمان كە ئەویش برازای بوو تەرمەكەیان خستە ناو گۆڕەكەوە.[١]

سەبارەت بە ساڵی وەفاتی عائیشە دەستەیەك دەڵێن لە ساڵی پەنجاو حەوتی كۆچیدا بووە، دەستەیەكیش دەڵێن لە ساڵی پەنجاو هەشتی كۆچیدا بووە، كاتەكەشی لە شەودا بوو، لە شەوی سێ شەممە حەڤدەی مانگی ڕەمەزاندا بوو،[٢] پاش ئەوەی نوێژی ویتر كرا وەفاتی كرد، خۆیشی فەرمانی كردبوو هەر شەو تەرمەكەی ئەسپەردە بكەن.[٣]

كاتێك وەفاتی كرد تەمەنی شەست و سێ ساڵ و چەند مانگێك بوو.[٤]

عائیشە ئافرەتێكی زۆر زانا بوو، گەورە هاوەڵان سەبارەت بە فەرزو سوننەتەكان پرسیاریان لەو دەكرد،[٥] ئەوەش نامۆ نیە، چونكە نزیكترین كەس و خۆشەویستترین كەسی پێغەمبەر (ﷺ) بووە.

---

[١] - أسد الغابة، ج٧، ص ٢٠٨.

[٢] - أسد الغابة، ج٧، ص ٢٠٨.

[٣] - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١٩٢.

[٤] - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١٩٣.

[٥] - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١٨٠-١٨٣.

## هەشتەم: ماڵئاوایی حوسەینی کوڕی عەلی (رضي الله عنه)

ئەم هاوەڵەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) یەکێکە لە خۆشەویستترین و نزیکترین و لێکچووترین و پایەدارترینی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەمە حەسەنی کوڕی عەلیە، کوڕی فاطیمەی کچی پێغەمبەری خوایە (ﷺ)، کوڕی ئامۆزای پێغەمبەر(ﷺ)، باوکی موژدەپێدراوی بەهەشت و چوارەم خەلیفەی موسڵمانانە، دایکی کچی پێغەمبەر(ﷺ) و گەورەی ژنانی بەهەشتە، باپیرەشی موحەممەدی پێغەمبەری خوایە، رەیحانە خۆشەویستەکەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ)، ئەو منداڵە چاوگەشەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) ماچی دەکرد، دەیگرتە کۆش.

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی بیست فاطیمەی کچی منداڵی بووە خێرا چوو بۆ ماڵیان، فەرمووی (أروني ابني ما سميتموه)،(ئادەی کوڕەکەمم نیشان بدەن، ناوی چیتان لێ ناوە؟) عەلی کوڕی ئەبوو طالیبیش وتی ناوم ناوە حەرب، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی (بل هو حسين)،[1] بەڵکو ناوی حوسەینە.

ئوسامەی کوڕی زەید دەڵێت: شەوێك دام لە دەرگای ماڵی پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەرم (ﷺ) بە جۆرێك شتێکی لە خۆی گرمۆڵە کردبوو کە نەمدەزانی چیە، جا کە ئیشەکەم تەواو بوو وتم بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوە چیت پێیە وا

[1] - صحيح ابن حبان، الرقم ٧٠٦٨، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٧٢٢، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١١١٤١، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٧٤٦، ضعفه الألباني في سلسلة الاحاديث الصحيحة، الرقم ٣٧٠٦، لكن حسنه شعيب الأرناؤوط، و صححه الذهبي في التلخيص.

بەرگت بۆ گرمۆڵە کردووە؟ پێغەمبەر(ﷺ) کە بەرگەکەی لابرد بینیم حەسەن و حوسەینی لە باوەش ناوەو فەرمووی (هذان ابناي و ابنا ابنتي اللهم أحبهما فأحبهما و أحب من يحبهما)،[1] (ئەوە دوو کوڕەکەمن، کوڕانی کچەکەمن، خوایە من ئەم دوانەم خۆش دەوێن دەی تۆیش خۆشت بوێن و ئەوەشت خۆش بوێت کە ئەم دوانەی خۆش دەوێن).

رۆژێك پێغەمبەر(ﷺ) لەماڵی عائیشە دەرچوو و دای بە لای ماڵی فاتیمەی کچیدا، تەماشای کرد حوسەین دەگری، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ئەریٚ نازانیت گریانی حوسەین ئازارم دەدات؟![2]

رۆژێك پێغەمبەر(ﷺ) لە ماڵی ئوممو سەلەمە بوو، فەرمویو با کەس نەیەتە ژوورەوە، حوسەین هات و دەستی کرد بە گریان، ئوممو سەلەمە رێی دا بچێتە ژوورەوە، چوویە ژوورەوەو لای پێغەمبەر(ﷺ) دانیشت، جبریل فەرمووی ئوممەتەکەت دواتر دەیکوژن، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ئەوانە دەیکوژن و باوەڕداریشن؟(يقتلونه و هم مؤمنون) فەرمووی بەڵێ، ئینجا خۆڵەکەی پیٚ نیشان دا.[3]

---

١ - سنن الترمذي، الرقم ٣٧٨٧، حسنه الألباني في صحيح و ضعيف سنن الترمذي، الرقم ٣٧٦٩، صحيح ابن حبان، الرقم ٧٠٧٧.

٢ - المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٢٧٧٨.

٣ - سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٨٩ و قال الذهبي إسناده حسن.

خەڵکی کووفە هەر لە سەردەمی موعاویەوە نامەیان دەنووسی بۆ حوسەین و داوایان لێدەکرد بچێت بۆ لایان تا بەیعەتی پێبدەن، بەڵام حوسەین رازی نەدەبوو، ئینجا خەڵکێکیان هاتن بۆ لای ئیبنولحەنەفیەو داوایان لێکرد بچێت بۆ لایان، ئەویش رازی نەبوو، ئینجا ئیبنولحەنەفیە هات بۆ لای حوسەین و هەواڵەکەی بۆ باسکرد، حوسەینیش وتی ئەو خەڵکە دەیانەوێت نان بەسەر ئێمەوە بخۆن.[1]

کاتێك موعاویە مرد یەزید نامەی نارد بۆ وەلیدی کوڕی عوقبە کە والی مەدینە بوو، داوای لێکرد بەیعەتی بۆ وەربگرێت، ئینجا وتی سەرەتا لە کەسە بەناوبانگەکانەوە دەست پێ بکەو لەگەڵ حوسەین نەرمونیان بە، وەلیدیش ناردی بە شوێن حوسەین و ئیبن زوبەیردا، ئەو کاتەش هێشتا شەو بوو، داوای کرد لە هەردووکیان بەیعەت بدەن بە یەزید، ئەوانیش وتیان با بەیانی بێتەوە بزانین خەڵکی چی دەکەن، ئەوەبوو هەر ئەو شەوە لە مەدینە دەرچوون بەرەو مەککە.[2]

دواتر حوسەین بڕیاری دا بەرنگاری یەزید ببێتەوە، پرسی بە هاوەڵان و کەسایەتیە دیارەکان کرد و خەڵکی عێراقیش پشتگیری خۆیان بۆ نیشاندا، هاوەڵان تکایان لێکرد ئەو هەنگاوە نەنێت و بە گوێی خەڵکی عێراق نەکات

١ - البداية والنهاية، ج٨، ص ١٦١.

٢ - سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٩٥.

چونکە پێشتر بەرامبەر بە عەلی باوکی و حەسەنی برای ناپاك بوون و ئەمجارەش بەرامبەر بە حوسەینیش هەر وا دەبن، بەڵام حوسەین بە داواکەیان رازی نەبوو و بە ماڵ و منداڵ و دەوروبەرەکەیەوە بەرەو عێراق بەڕێ کەوت.

لە خاکی کەربەلادا حوسەین بەرەبەرە هەستی کرد بە ناپاکی بەڵێنەکانی عێراقیەکان، لە شوێنی مانەوەی خۆی دانیشتبوو و سەرقاڵی خوێندنی قورئان بوو و فرمێسکیش بەسەر کوڵمەکانیدا دەخلیسکا، کابرایەك هاتە ژوور و پێی وت بە دایك و باوکمەوە بە قوربانت بم ئەی کچەزای پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆچی هاتویتەتە ئەم وڵاتە، ئەویش وتی ئەوە هەمووی نامەی خەڵکی کووفەیە کە بۆیان ناردووم کەچی ئێستا وا دەبینم نیازی کوشتنی منیان هەیە، ئەگەریش ئەوە بکەن هیچ سنوورێکی خوا نامێنێت نەیبەزێنن و خوای گەورەش کەسی وا زاڵ دەکات بەسەریاندا کە سەرشۆڕیان بکات.[١]

شەوی عاشوورا بوو، حوسەین هاوەڵانی کۆکردەوەو سوپاسی خوای کرد و وتی من وایدەبینم ئەو خەڵکە سبەینێ لەگەڵتان دەجەنگن، منیش مۆڵەتی هەمووتانم داوەو گەردنتان ئازاد بێت، کام لەئێوە هێز و توانای هەیە با یەکێك لە ئالوبەیتم بباتە لای خۆی و هەموو بڵاوەی لێ بکەن، چونکە ئەوان تەنها بۆ

١ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ١٦٩.

من دەگەڕێن، بەڵام کەسوکارەکەی وتیان دوای تۆ ژیانمان ناوێت بەخوا لێت جیا نابینەوە، هاوەڵەکانی تریشی هەمان شتیان وت.[١]

ئەو شەوە تا بەیانی حوسەین و یارانی سەرقاڵی نوێژ و پەرستش بوون.[٢]

بەیانی هات و حوسەین ئەم نزایەی کرد: خوایە تۆ متمانەی منیت لە هەموو نارەحەتیەك و دەربازکەری منیت لە هەموو سەختیەك، لەم بارەی تووشم بووە تۆ پەنای منیت، تۆ خاوەنی هەموو بەخششێك و خاوەنی هەموو چاکەیەکیت.

ئینجا roوویکردە عومەری کوڕی سەعید و پێی وت: پەلە مەکەن، سوێند بەخوا من تەنها بە نامەی کەسانی وەك ئێوە هاتوم کە دەیانوت سوننەت مردووەو دووروویی زاڵ بووەو سنوورەکانی شەریعەت پەیڕەو ناکرێن دەی وەرە بۆ لامان بەڵکو خوا بە هۆی تۆوە باری ئوممەت چاك بکات، بۆیە منیش هاتوم، جا ئەگەر حەز بەوە ناکەن ئەوە من دەگەڕێمەوەو ئێوەش بزانن دروستە من بکوژن یان خوێنم حەڵاڵ بکەن؟ مەگەر من کچەزای پێغەمبەرەکەتان نیم، کوڕی ئامۆزای پێغەمبەر(ﷺ) نیم؟ مەگەر حەمزەو عەبباس و جەعفەر مامەکانم نیم؟ مەگەر نەتانبیستووە پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بە من و براکەم دەیفەرموو ئەم دوانە گەورەی گەنجانی بەهەشتن؟

---

١ - سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠١.

٢ - المنتظم لابن الجوزي، ج٥، ص ٣٣٨.

له کەربەلائی خاکی جەنگەکەدا ژمارەی ئەوانەی لەگەڵ حوسەین بوون نزیکەی چل و پێنج ئەسپ سوار و سەد کەسی پیادە بوون.[١]

حوسەین لەویّ دوا وتەکانی خۆی بۆ هاوەڵانی پێشکەش کردو وتی گوێم لیّ بگرن و پەلەم لیّ مەکەن تا ئامۆژگاریتان بکەم و پۆزشتان بۆ بهێنمەوە بەهۆی ئەم هاتنەمەوە، ئینجا کە قسەکانی تەواو بوو خوشکەکانی دەستیان کرد بە گریان، حوسەین عەبباسی برای و عەلی کوڕی نارد تا بێدەنگیان بکات.[٢]

یەکەم کەس کە دەستی کرد بە جەنگەکە مەولایەکی عوبەیدوڵای کوڕی زیاد بوو، عەبدوڵای کوڕی تەمیمی کەلبی چوو بۆی و کوشتی،[٣] بەڵام رایەکی تر دەڵێت عومەر یەکەم کەس بوو تیرێکی وەشاند و وتی شایەت بن من یەکەم کەس بووم تیرەکەم وەشاند.[٤]

حوسەین دانیشتبوو و تیر بەملاوبەولایدا دەهاوێژرا، یەکێك لە تیرەکان بە کوڕێکی سیّ ساڵەی کەوت، ئەوکات ئیتر حوسەین جلی جەنگی پۆشی و دەستی کرد بە جەنگ کردن هەتا هەموویان کوژران، عەلی کوڕیشی بەشداری جەنگەکە بوو، حوسەین تینووی بوو، کەسێك ئاوی بۆ هێنا و دایە دەستی، لەولاوە

١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٨١، سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٨.

٢ - الكامل في التاريخ، ج٣، ص ٤١٨.

٣ - سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٢.

٤ - الكامل في التاريخ، ج٣، ص ٤٢١.

حوصەینی کوڕی تەمیم تیرێکی وەشاند و تیرەکە دای لە ناو دەمی حوسەین و خوێن لە دەمیەوە دەچۆڕایە ناو دەستی، حوسەین سوپاسی خوای دەکرد و روویکردە ئاوی فورات تا خۆی بگەیەنێتە ئەوێ، سەربازان رێیان لێگرت بچێت بەرەو ئاوەکە، کەسێکی تر تیرێکی بۆ وەشاندو پێکای، دواجار گەمارۆ درا هەرچەندە ئەو هەر بەردەوام بوو لە جەنگ کردن و دووری دەخستنەوە، دواجار شیمر هاواری کرد دایکتان رۆڵە رۆتان بۆ بکات چاوەڕێی چین بیکوژن، ئەوەبوو زورعەی تەمیمی چووە پێشەوەو شمشێرێکی دا لە باڵی، حوسەینیش شمشێرێکی دا لەسەر شانی، ئینجا سینانی نەخەعی هاتە پێشەوەو دوو شمشێری لێداو خستی، دواتر دابەزی تا سەریشی لێبکاتەوە، بەڵام خەولی ئەصبەحی هات و سەری حوسەینی لێکردەوەو بردی بۆ عوبەیدوڵای کوڕی زیاد، هیوای وابوو خەڵاتی بکات، بەڵام عوبەیدوڵا هیچی پێنەدا، جەستەی حوسەین هەمووی شوێن پێکان بوو نزیکەی سی و سێ جار پێکرابوو.[١]

سەبارەت بە کاتی شەهید بوونی لە رۆژی عاشوورای ساڵی شەست و یەکی کۆچیدا بوو،[٢] دەوترێت ئەو رۆژە شەممە بووە، رایەکی تر دەڵێت بەڵکو رۆژی دووشەممە بوو.[٣]

---

١ - سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٢.

٢ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٨١.

٣ - سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣١٨.

لەگەڵ حوسەیندا ئەم کەسە نزیکانەشی لەگەڵیدا شەهید بوون:

جەعفەر و حوسەین و عەبباس و موحەممەد و عوثمان و ئەبووبەکر کە برای حوسەین بوون، عەلی ئەکبەر و عەبدوڵای کوڕانی حوسەین،[١] ئەبووبەکری کوڕی حوسەین،[٢] عەبدوڵا و قاسم و ئەبووبەکری کوڕانی حەسەنی برای.[٣]

شینی درۆزنانەی عێراقیەکان خۆی دەنواند، یەکێك لە سەربازانی عێراقی جلوبەرگەکەی فاتیمەی کچی حوسەینی دەبرد و دەشگریا، فاتیمە پێی وت بۆچی دەگریت؟ سەربازەکە وتی چۆن دەبێت کەلوپەلی نەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بە تالان بەرم و نەگریم؟ فاتیمە وتی دەی مەیبەو دایبنێ، سەربازەکە وتی ئاخۆ دەترسم کەسێکی تر بیبات.[٤]

---

١ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ١٨٩.

٢ - تاريخ الطبرى، ج٣، ص ٣٤٣.

٣ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ١٨٩.

٤ - سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٣.

## نۆیەم: ماڵئاوایی سەلمانی فارسی (رضي الله عنه)

سەلمانی فارسی هاوەڵی نزیکی پێغەمبەر (ﷺ) و نەوەی فارسەکانە، هاوەڵێکی زۆر ناسراو و دڵسۆز بە ئیسلامە.

سەبارەت بە شوێنی لەدایکبوون و گەورەبونی هەریەك لە رامهورمز و ئەصفەهان هاتووە،[١] بەڵام لە زۆربەی گێڕانەوەکاندا ناوی گوندێکی سەر بە ئەصفەهان هاتووە.

سەلمانی فارسی دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) بە ئازادی بەشداری غەزای خەندەق بووم، دوای ئەوە یەك غەزاش لە پێغەمبەر (ﷺ) دوانەکەوتم و لە هەموویاندا بەشدار بووم.[٢]

جارێك ئەبووسوفیان دای بەلای سەلمانی فارسی و بیلال و صوهەیب و چەند کەسێکی تردا، ئەوانیش تانەیان لێدا، ئەبووبەکر وتی ئەوە پیاوماقوڵی قورەیشە، وای پێ دەڵێن؟! دواتر ئەبووبەکر هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی (ئەی ئەبووبەکر لەوانەیە تووڕەت کردبن، ئەگەر ئەوانت تووڕە کردبێت ئەوە پەروەردگارتت تووڕە

١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٣، ص ١٤١.

٢ - سير أعلام النبلاء، ١، ص ٥١٠-٥١١.

کردووە)، خێرا ئەبووبەکر چوویەوە بۆ لایان و وتی برا ئازیزەکانم ئەرێ ئێوەم توورە نەکرد؟ وتیان نا ئەی ئەبووبەکر خوا لێت خۆش بێت.[١]

جارێك سەلمان لەگەڵ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص دەمەبۆڵەیەکی بوو، سەعد وتی ئەی سەلمان ئادەی رەچەڵەکی خۆتم بۆ بڵێ، سەلمان وتی من باوکێکم نیە لە ئیسلامدا بووبێت، من سەلمانی کوڕی ئیسلامم، ئینجا ئەو قسەیە گەیشتەوە دەمی عومەر، دوای ماوەیەك عومەر رێی کەوتە سەعد، وتی ئەی سەعد ئادەی رەچەڵەکی خۆتم بۆ بڵێ، خێرا سەعد زانی عومەر بەسەرهاتەکەی بیستووەتەوە، بۆیە وتی توخوا ئەی ئەمیری باوەڕداران وازم لێ بهێنە، ئەویش وتی هەر دەبێت بیڵێیت، سەعد رەچەڵەکی خۆی وت، عومەر وتی قورەیش دەزانن خەططاب شکۆدارترینیان کەس بوو لە سەردەمی نەفامیدا، دەی من عومەری کوڕی ئیسلامم برای سەلمانی کوڕی ئیسلامم، بەخوا ئەگەر لەبەر شتێك نەبوایە سزام دەدایت.[٢]

سەبارەت بە کاتی مردنی سەلمانی فارسی رای جیاواز هەیە، رایەك دەڵێت لە سەردەمی عومەری کوڕی خەططابدا وەفاتی کردووە، رایەکی تر دەڵێت لە کۆتاییەکانی سەردەمی عوثمانی کوڕی عەففاندا وەفاتی کردووە، رایەك دەڵێت

---

١ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٥٤٠.

٢ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٥٤٤.

له ساڵی سی و پێنجی كۆچی بووه، رایەكیش سەرەتای ساڵی سی و شەشی كۆچی دێنێت،[١] مردنەكەشی له مەدائین بوو.[٢]

كاتێك سەلمان له سەرەمەرگدا بوو، سەعد و ئیبن مەسعوود چوون بۆ سەردانی، سەلمان دەستی كرد بە گریان، وتیان بۆچی دەگریت؟ وتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەڵێنێكی پێ بەخشین كەچی نەمانپاراست، فەرمووی (با توێشووی هەركامتان له دنیادا وەك توێشووی سوارێك بێت).[٣]

سەلمان بە خۆی دەوت (سلمان بمیر) ئەمەی بە فارسی دەوت، واتە سەلمان بمرە.[٤]

ئینجا سەلمان ژنەكەی خۆی بانگ كردە ژوورەكەی، ژوورەكەی لە بەرزاییەكەوە بوو و چوار دەرگای هەبوو، وتی ئەو دەرگایانە بكەرەوە، چونكە ئەمڕۆ میوانم دێت، نازانم له كام دەرگاوە دێن، ئینجا داوای میسكی كرد و وتی بیكەرە كەمێك ئاو و بیڕژە بە دەوری جێگەكەمدا، ژنەكەی دەڵێت دواتر چوومەوە بۆ لای دەبینم گیانی سپاردبوو.[٥]

---

١ - البدايةو النهاية لابن كثر، ج٥، ص ٣١٧.

٢ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٥٥٤.

٣ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٥٥٢.

٤ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٩٠.

٥ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٥٥٣.

سەلمان ئەو بۆنی میسکەی بە دەستکەوتی غەزا دەستکەوتبوو و هەڵیگرتبوو بۆ کاتی مەرگی، دەیوت فریشتەکان دێن بۆ لام، ئەوان نان ناخۆن، بەڵام بۆن دەکەن.[١]

تێڕوانینی ئیسلام بۆ مەرگ تێڕوانینێکی ترس و نامۆیی نیە، وەك چۆن تێڕوانینی بۆ ژیان دیدی بێزاری و تاسەی مەرگ نیە، ئیسلام پێمان دەڵێت تا لە ژیاندایت بەختەوەر بژی، چی پاکە بۆ خواردن وپۆشین و نۆشین و هاوسەرگیری کەمتەرخەم مەبە تیایدا، مافی جەستەو روخسار و ناخت بدە، خۆشی ببەخشە بە چواردەورت، هیچ کاتئاوات بە مەرگ مەخوزاە، ئاوات خواستن بە مەرگی قەدەغە کردووە، بەڵام کە مەرگ هات پێشوازی لێدەکات، پێت دەڵێت مەرگ مەرگی جەستەیەو گواستنەوەی رۆحتە بۆ دنیای ئاخیرەت، لەو ساتەدا گەشبین بە، زمانت بە یادی خوا رام بێنە، سەلمان ئاسا ماڵت بۆنخۆش بێت، کە کەسەکەش مرد، با بشۆردرێت و بە بەرگی پاك کفن بکرێت، بۆنخۆش بکرێت، نوێژی لەسەر بکرێت، کەس لە پێش تەرمەکەوە نەڕوات، هەرکەس دانیشتووە هەستێتەسەر پێ با تەنانەت تەرمی جوولەکەو گاوریش بێت، ئەسپەردە بکرێت و نزای خێری بۆ بکرێت، واز لە خراپەکانی بهێنن و باسی چاکەکانی بکەن، ئەمەیە رێنمایی ئیسلام بۆ مەرگ.

١ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٩٢-٩٣.

## دەیەم: ماڵئاوایی فاتیمەی کچی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

فاطیمە کچی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵایە، باوکی سەرداری مرۆڤایەتی و ئازیزی ئیماندارانە، موحەممەدی نێردراوی خوایە.[1]

دایکی ناوی خەدیجەی کچی خوەیلیدە، دایکی باوەڕداران و موژدەپێدراوی بەهەشت و یەکەم و خۆشەویستترین هاوسەری پێغەمبەری خوایە(ﷺ).

ذەهەبی دەڵێت لەدایکبوونی فاطیمە کەمێك پێش دابەزینی سروش بوو بۆ سەر پێغەمبەر (ﷺ).[2]

کاتێك عەلی کوڕی ئەبوطالیب فاطیمەی کچی پێغەمبەری خوای (ﷺ) بە هاوسەر گرت، بۆ ماڵێك دەگەڕا تا تیایدا نیشتەجێ بێت، بەڵام خانوویەکی دوور لە ماڵی پێغەمبەری خوای (ﷺ) دەست کەوت و لەوێ گواستیەوە، پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆ ماڵیان و پێی فەرموون دەیەوێت نزیکیان بکاتەوە لە ماڵی خۆی، فاطیمەش وتی داوا لە حارثە بکە تا شوێنەکەی بگۆڕێتەوە لەگەڵمان تا نزیك بینەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (حارثە هێندە شوێنی خۆی بۆ چۆڵکردوین ئیتر رووم نایەت پێی بڵێم)، حارثە ئەوەی بیستەوەو و هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بیستوومە دەتەوێت فاطیمە لێتەوە نزیك بێت و ئەوەش خانووەکانی منن، من خۆمو ئەوەشی هەمە

---

[1] - الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ٤، ص ١٨٩٣.

[2] - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١١٩.

بۆ خوا و پێغەمبەری خوایە، سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەی تۆ لێم وەردەگریت لام زۆر خۆشترە لەوەی وازی لێ دێنیت بۆم، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (راست دەکەیت، خوا بەرەکەت بڕژێت بەسەرتدا)، ئەوەبوو فاطیمە هاتە ناو خانوویەکی حارثە کە نزیك مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) بوو، حارثە لە نزیك مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) چەند خانوویەکی هەبوو، هەر جارەو یەکێك لەو خانووانەی چۆڵ دەکرد بۆ خۆشەویستێکی پێغەمبەر (ﷺ) تا هەموو خانووەکانی ئەو شوێنەی دا بە پێغەمبەر (ﷺ) و هاوسەرەکانی.[١]

لە غەزای ئوحوددا کە پێغەمبەر (ﷺ) بریندار بوو، فاطیمەی چی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و عەلی کوڕی ئەبووطالیب برینەکەی پێغەمبەری خوایان (ﷺ) دەشۆرد، عەلی ئاوی دەکرد بە دەستی فاطیمەدا و فاطیمەش برینەکەی دەشۆرد.[٢]

عائیشەی دایکی باوەڕداران باسی سەرەمەرگی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکات و دەڵێت فاطیمە هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) کە دەچوو بەڕێدا دەتوت هەمان رێکردنی پێغەمبەرە(ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی مەرحەبا لە کچەکەم، ئینجا لای خۆیەوە داینیشاند، دواتر چپەیەکی بۆ کرد و فاطیمە گریا، وتم بۆچی دەگریت؟ دواتر پێغەمبەر (ﷺ) چپەیەکی تری بۆ کرد و فاطیمە

١ - الطبقات الکبری لابن سعد، ج٨، ص ١٦٦.

٢ - صحیح البخاري، الرقم ٣٨٦٥، صحیح مسلم، الرقم ٣٤٣٢، صحیح ابن حبان، الرقم ٦٦٨٣.

دەستی کرد بە پێکەنین، منیش وتم تا ئێستا نەمدیوە خەم و خۆشی ئاوا لەیەك نزیك بن، وتم چۆن بوو واگریایت و دواتر پێکەنیت؟ فاتیمەش وتی نهێنی پێغەمبەر (ﷺ) ئاشکرا ناکەم، دواتر کە پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد، چووم هەمان پرسیارم کردەوە لە فاطیمە، ئەویش وتی چپاندی بە گوێمدا (جیبریل هەموو ساڵێك یەك جار قورئانی لەگەڵ دەور دەکردمەوە، ئەمساڵ دوو جار لەگەڵم دەوری کردەوە، وادەزانم ئەمە ئاماژەی مەرگمە، تۆیش یەکەم کەسیت بە من دەگەیتەوە)، منیش دەستم کرد بە گریان، دواتر فەرمووی (ئایا رازی نابیت تۆ گەورەی ژنانی بەهەشت –یان گەورەی ژنانی باوەڕداران– بیت؟) منیش بەوە پێکەنیم.[١]

پاش وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) و بەیعەتدان بە ئەبووبەکری صدیق، فاطیمەی کچی پێغەمبەر (ﷺ) و عەبباسی مامی پێغەمبەریش (ﷺ) چوون بۆ لای ئەبووبەکرو داوای میراتییان کرد، ئەبووبەکریش پێی راگەیاندن کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی دوای خۆی میراتی جێناهێڵێت و هەرچی جێهێشت ئەوە صەدەقەیە،[٢] لەسەر ئەوە دڵئێشانێ لەنێوان فاتیمە و ئەبووبەکردا دروست بوو.

---

١ - صحيح البخاري، الرقم ٣٤٤٦.

٢ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ٣١٥.

فاطیمە پێنج مانگ یان شتێ لەو چەشنە دوای وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) ژیاو لە تەمەنێکی کەمدا کۆچی دوایی کرد، دەوترێت تەمەنی بیست و چوار یان بیست و پێنج یان بیست و نۆ ساڵ بووە، بەڵام راستتر ئەوەیە تەمەنی بیست و چوار ساڵ بوو کە کۆچی دوایی کرد.[١]

راستتریش ئەوەیە شەش مانگ پاش وەفاتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆچی دوایی کرد.[٢]

کاتێك فاطیمە نەخۆش کەوت، ئەبووبەکر چوو بۆ لای و داوای مۆڵەتی کرد تا فاتیمە ببینێت، عەلی وتی ئەی فاطیمە ئەوە ئەبووبەکرە هاتووە بۆ لات و داوای مۆڵەت دەکات، ئەویش وتی حەز دەکەیت مۆڵەتی بدەم؟ عەلی وتی بەڵێ، فاطیمەش مۆڵەتی پێدا، ئەبووبەکر هاتە ژوورەوەو هەوڵی دەدا دڵی فاطیمە بهێنێتەوەو وتی سوێند بەخوا چی سامان و کەسوکار و عەشیرەتم وەلاناوە تەنها لەبەر رەزامەندی خواو پێغەمبەرەکەی و رەزامەندی ئێوەی ئالوبەیت بووە، ئیتر دڵی فاطیمەی دەهێنایەوە هەتا فاطیمە رازی بوو.[٣]

---

[١] - سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص ١٢١.

[٢] - صحيح البخاري، الرقم ٢٩٤٣.

[٣] - السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١١٩١٣ و قال إسناده صحيح.

فاطیمە پێش مردنی تووشی نەخۆشیەکی سەخت بوو، لەو کاتەشدا خەمی ئەوەی بوو کە چۆن ببرێت بەرەو گۆڕستان، ئەوەبوو کاتێك ئەسمائی کچی عومەیسی لابوو، بە ئەسمائی وت چەندە پێی ناخۆشە بە قوماشێکەوە ببرێت و جەستەی دەربکەوێت؟ ئەسمائیش وتی بەخوا دارەمەیتێکت بۆ دروست دەکەم وەك ئەوەی کە بینیم لە حەبەشە دروست دەکرا، فاطیمەش وتی ئادەی نیشانم بدە چۆنە، ئەویش بۆی دروست کرد، فاطیمەش پێکەنی، ئەوەش تاکە پێکەنینی بوو پاش وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ).[1]

کاتێ وەفاتی کرد عەلی هاوسەری تەرمەکەی شۆرد، بە شەو ئەسپەردە کرا و عەبباسی مامی پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی لەسەر تەرمەکەی کرد و هەریەك لە عەلی هاوسەری و فەضل دابەزینە ناو گۆڕەکەی.[2]

بەڵام لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە کە عەلی خۆی نوێژی لەسەر کرد و بە شەو ئەسپەردەی کرد و ئەبووبەکری بانگ نەکرد.[3]

ئەسمائی کچی عومەیس دەڵێت فاطیمە پێی وتم زۆرم پێ ناخۆشە کە قوماشێك دەدرێت بەسەر ئافرەتدا و جەستەی دەردەکەوێت، منیش وتم ئەی

---

[1] - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٧١٢،

[2] - سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص ١٢٨.

[3] - صحيح مسلم، الرقم ٣٣٩١.

کچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من لە حەبەشە شتێکم بینیوە با بۆت باس بکەم، ئەوەبوو بە بڕێ دار دارەمەیتێکی دروست کرد و ئینجا قوماشێکی دا بەسەریدا دا، فاتیمە وتی ئەمە زۆر چاکە، ئەگەر مردم تۆ و عەلی بمشۆن و کەسی تر نەیەتە ژوورەوە، ئەوەبوو کە وەفاتی کرد، عائیشە هات تا بێتە ژوورەوە، ئەسمائیش وتی مەیەرە ژوورەوە، عائیشە لای ئەبووبەکر سکاڵای کرد، ئەبووبەکر هات و وتی بۆ ریی نادەن؟ ئەسمائیش وتی فاطیمە خۆی فەرمانی کرد تەنها من و عەلی بیشۆین، ئەبووبەکریش وتی فاطیمە خۆی چۆنی وتووە وا بکەن.[١]

[١] - سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص ١٢٨-١٢٩.

## یانزەهەم: ماڵئاوایی مەرگی خالیدی کوڕی وەلید (رضي الله عنه)

خالید لە سەردەمی نەفامیدا لەناو قورەیشدا پێگەیەکی گرنگی هەبوو، ئەویش بریتی بوو لە بەرپرسیارێتی سەربازی، لە جەنگی ئوحوددا یەکەم هەنگاوی دژایەتی خالید دژ بە موسڵمانان دەرکەوت، تیایدا خالید سەرکردایەتی سوارەی بێباوەڕانی دەکرد کە نزیکەی سەد سوارە بوون،[١] لە جەنگی خەندەقیشدا دووبارە خالید سەرکردایەتی سوارەی بێباوەڕانی دەکرد.

پاش ڕێککەوتنی حودەیبیە خالیدی کوڕی وەلید موسڵمان بوو، خالید دەڵێت: کە چوومە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتم ئە پێغەمبەری خوا (ﷺ) تۆ دەزانیت من لە چەند جەنگ و هەڵوێستدا دژایەتیم کردویت، بۆیە لە خوا داوا بکە لەوانەم خۆش بێت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئیسلام ئەوەی پێش خۆی دەسڕێتەوە)، منیش وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر ئەوە بەڵێنم پێبدە کە ئەو نزایەم بۆ بکەیت، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (اللهم اغفر لخالد بن الوليد كل ما أوضع فيه من صد عن سبيلك)،[٢] (خوایە لەهەموو ئەو ڕێگریانەی خالید خۆش بە کە خستیە بەردەم ڕێ و بانگەوازەکەت).

خالیدی کوڕی وەلید ناسراوە بە شمشێری خوا، کونیەکەی ئەبوو سولەیمانە،[٣] یەکێکە لە هاوەڵە زۆر گەورە و ناسراوەکانی پێغەمبەری خوا

---

١ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ١٣.

٢ - دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ١٦٨٢، البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ٢٤٠.

٣ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٥١.

(صلى الله عليه وسلم) کە لە مێژووی ئیسلامیدا رۆڵێکی کارای هەبووە، یەکێك بوو لە رێبەرانی فتووحاتی ئیسلامی.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە کاتی جەنگی موئتەدا دەیفەرموو (خوایە خالید شمشێرێکە لە شمشێرەکانی خۆت، خوایە لەسەر دەستی سەرکەوتن ببەخشی)، لەو رۆژەوە خالید ناوی نرا شمشمێری خوا (سیف الله).[١]

هەروەها دەیفەرموو (لا تؤذوا خالدا فإنه سيف من سيوف الله صبه الله على الكفار)،[٢] (ئازاری خالید مەدەن، چونکە ئەو شمشێرێکە لە شمشێرەکانی خوا کە بەرووی بێباوەڕاندا هەڵیکردووە).

خالید ماوەیەك پێش مردنی جارێك چوویەوە بۆ مەککەو عومرەیەکی کرد و گەڕایەوە بۆ حیمص،[٣] لەوێ مایەوە تا کۆچی دوایی کرد.

خالیدی کوڕی وەلید لە ساڵی بیست و یەکی کۆچیدا وەفاتی کرد،[٤] ئەو کات تەمەنی شەست ساڵان بوو.[٥]

---

١ - صحيح ابن حبان، الرقم ٧١٥٧، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٧٩٧٦، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢١٩٥٠، مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ٣٦٢٨٦، صححه شعيب الأرناؤوط، حسنه الألباني في أحكام الجنائز(٣٣/١).

٢ - صحيح ابن حبان، الرقم ٧٢٠٠، المعجم الصغير للطبراني، الرقم ٥٨١، صححه شعيب الأرناؤوط.

٣ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٣٨٣.

٤ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص ٣٩٧.

٥ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٣٦٧.

کاتێك خالید لە سەرەمەرگدا بوو دەیوت بەشداری ئەو هەموو جەنگەم کرد کەچی قەدەرم وابوو لەسەر جێگەکەم بمرم، دواتر وتی ئەگەر مردم چەك و ئەسپەکەم دابنێن بۆ رێی خوا.[١]

خالید کە لە سەرمەرگیدا بوو تەنها شتێك لە ژیاندا هەیبوو بریتی بوو لە ئەسپەکەی و چەکەکەی و کۆیلەیەکی، کە ئەم هەواڵە دواتر گەیشت بە عومەری کوڕی خەططاب، وتی رەحمەتی خوای لێ بێت ئاوا نەبوو کە ئێمە گومانمان پێ دەبرد–واتە سامانی بۆ خۆی دانەنابوو–.[٢]

خالید دەگریاو دەیوت لە ئەوەندە جەنگدا بەشداریم کرد، جەستەم بستێکی بێ برینی پێوە نەماوە، یان شمشێری بەرکەوتووە یان رم یان تیر، کەچی وا لەسەر جێگەکەم دەمرد.[٣]

خالید پێش مردنی بەو بارە نەخۆشیەی سەرەمەرگیەوە قسەی دەکرد بۆ ئەوانەی کە لەلای بوون و دەیوت: لەم سەرزەویەدا هیچ شتێك نیە هێندەی ئەوە لام خۆشەویست بێت کە لە شەوێکی سارددا لە ناو دەستەیەکی سوپایی کۆچەراندا بم کە بەرامبەر دوژمن لە چاوەڕوانی جەنگدان، دەی گرنگی بدەن بە جیهاد.[٤]

١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٥٥.
٢ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص ٣٩٧.
٣ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٣٨٢.
٤ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٥٤.

کاتێك خالید لە سەرەمەرگدا بوو وەسیەتێکی کرد بۆ عومەر، عومەریش وەسیەتەکەی جێبەجێ کرد—ئەمەش بەڵگەیەکە کە خالید لە مەدینە مردووە— و باسی خالیدی دەکرد و دەیوت رەحمەتی خوا لە خالید، کەسێك ئاماژەی بە عومەر دا بۆچی کاتێك مابوو لاتبرد؟ عومەر وتی من تەنها لەبەرئەوە لامبرد چونکە دەستوالآیانە هەنگاوی دەنا و دەستوالآیانەش سامانی دەبەخشیەوە.[١]

خالید پێش مردنی دەیوت سەرقاڵ بوونم بە جیهاد بووە هۆکاری دواکەوتنم لە فێربوونی زۆربەی قورئان.[٢]

گێڕانەوەیەك هاتووە دەڵێت: عومەر چوو بۆ ئەسپەردەکردنی تەرمی خالید، ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوەی خالید لە مەدینە مردووە، بەلآم رای زۆرینە لەسەر ئەوەیە خالید لە حیمص مردووە،[٣] ذەهەبی دەڵێت: رای راستتر ئەوەیە خالید لە حیمص مردووە.[٤]

کاروانێکی حاجیانی شام هاتنە مەدینە و هەواڵیان دا بە عومەر کە کاتێك ئەوان هاتون خالید مردووە، عومەر دڵگرانیەك دایگرت و زوو زوو رەحمەتی بۆ دەنارد.[٥]

---

١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٥٥.

٢ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٥٥.

٣ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٥٥.

٤ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٣٨٤.

٥ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٣٨٣.

## دوانزەهەم: ماڵئاوایی بیشری کوڕی بەرائی کوڕی مەعروور (رضي الله عنه)

بیشری کوڕی بەرائی ئەنصاری لەگەڵ باوکیدا بەشدار بوو لە بەیعەتی عەقەبەدا.[١]

لە جەنگی بەدر و ئوحود و خەندەقیشدا بەشداری کرد،[٢] لە ڕێککەوتنی حودەیبیەشدا بەشدار بوو.[٣]

بیشری کوڕی بەرائی کوڕی مەعروور لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان،[٤] یەکێك بوو لە پیاوماقووڵ و کەسە دیارەکانی ناو هۆزەکەی،[٥] بیشر تیرهاوێژی نزیك لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو،[٦] لە جەنگی بەدر و ئوحود و خەندەقیشدا بەشداری کرد،[٧] لە ڕێککەوتنی حودەیبیەشدا بەشدار بوو.[٨]

لە جەنگی خەیبەردا کاتێك ئافرەتە جوولەکەکە گۆشتی بە دیاری هێنا بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ژەهری پێوە کردبوو، بیشر لەو گۆشتەی خوارد و بەهۆی

---

١ - تأريخ الإسلام للذهبي، ج١، ص٣٠٦-٣٠٧.

٢ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص١٦٧.

٣ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٥٧٠.

٤ - الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٦٧.

٥ - سير أعلام النبلاء للذهبي، ج١، ص٢٦٩.

٦ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٥٧٠.

٧ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص١٦٧.

٨ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٥٧٠.

ئەو خواردنەوە مرد،[١] ئەوەبوو دوای مردنی بیشر پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد بە کوشتنی ئەو ژنە جوولەکە.[٢]

بەسەرهاتی ئافرەتە جوولەکەکەش بەمجۆرە بوو: کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) فەتحی خەیبەری کرد و ژمارەیەکی زۆر لە جوولەکەکان کوژران، زەینەبی کچی حارث کە ئافرەتێکی جوولەکە بوو بەرخێکی برژاوی ژەهراوی بە دیاری هێنا بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، زۆربەی ژەهرەکەی لە باڵ و شانی بەرخەکەدا دانا چونکە بیستبووی پێغەمبەر (ﷺ) ئەو پارچەی بەرخی لە هەموو پارچەکانی تر لا بەچێژترە، کاتێك ئەو بەرخەی هێنا بیشری کوڕی بەرائی کوڕی مەعروور لای پێغەمبەر (ﷺ) بوو، پێغەمبەر (ﷺ) بەشێ لە شانی بەرخەکەی هەڵگرت تا بیخوات، بیشریش بەشێك لە گۆشتەکەی هەڵگرت، کە پێغەمبەر (ﷺ) پارووەکەی خوارد بیشریش پارووەکەی خوارد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی دەست هەڵگرن چونکە شانی ئەم بەرخە هەواڵم پێ دەدات چی پێدا کراوە، بیشر وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوێند بەوەی رێزداری کردیت من ئەوەم لە خواردنەکەمدا بەدیکرد، بەڵام تەنها لەبەر گەورەیی و رێزی تۆ نەمتفاندەوە چونکە حەزم نەکرد خواردنەکەت لا بێزراو بکەم، کاتێك بینیم پاروەکەت خوارد خۆم لە تۆ لا لەپێشتر نەبوو و حەزم نەکرد جیا لە تۆ خۆم رزگار بکەم، بۆیە هیوام وابوو ئەوەی خواردت ژەهراوی نەبێت، بیشر هەر لەو شوێنەیدا رەنگی

---

١ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص١٦٧.

٢ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص٢١٠.

تێکچووو مرد، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە پشتی شانیەوە کەڵەشاخی گرت،[١] پێغەمبەری خوایش (ﷺ) ئافرەتەکەی بانگ کرد و پێی فەرموو چی وایکرد وا بکەیت؟ ئەویش وتی وتم ئەگەر پێغەمبەر بێت ئەوە زیانی پێ ناگەیەنێت، ئەگەریش پێغەمبەر نەبێت ئەوە لە کۆڵی هەموانی دەکەمەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد ئەو ژنە جوولەکەیە کوژرا،[٢] دواتر سێ ساڵ بەو ئازارەیەوە مایەوە تا هەر بەو ئازارەوە وەفاتی کرد وەك لە رۆژی وەفاتیدا فەرمووی (ما زلت أجد من الأكلة التي أكلت من الشاة يوم خيبر عددا حتى كان هذا أوان انقطع الأبهر مني)، (هێشتا بە برێ دەردی ئەو خواردنەوە دەناڵێنم کە لە رۆژی خەیبەر لە بەرخەکەم خوارد، ئیتر ئێستا توانای پێ نەهێشتم[٣])، ئەوەبوو پێغەمبەر (ﷺ) بە شەهیدی وەفاتی کرد.[٤]

---

١ - دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ١٦١٢، البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص٢١٠.

٢ - سنن أبي داوود، الرقم ٣٩٣٣، الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص١٧٢، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داوود، الرقم ٤٥١٤.

٣ - وشەی أبهر واتای شاخوێنبەر دەدات و پێغەمبەر () ئاماژەی بەوە داوە کە ژەهرەکە کاری کردۆتەسەری و شاخوێنبەری بڕیوە، بەڵام واتایەکی تر کە لە زمانەوانی عەرەبیدا بەو رستەی سەرەوە دێت واتە توانا و هێزی پێ نەهێشتووەو لەناوی دەبات. بۆیە لێرەدا ئاماژەمان داوە بە هەردوو واتاکە.

٤ - دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ١٦١٢.

## سیانزەهەم: ماڵئاوایی ثابتی کوڕی قەیس (رضي الله عنه)

ثابتی کوڕی قەیس هاوەڵی دیاری ناو پشتیوانان و وتاربێژیان بوو، هەروەك وتاربێژی خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو.[١]

ثابت لە غەزای ئوحود و غەزاکانی دواتریشدا بەشداری کرد و تا دوای وەفاتی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) ژیا.[٢]

هەروەها ثابتی کوڕی قەیس نووسەری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو

ثابت لە سەردەمی خیلافەتی ئەبووبەکری صدیقدا لە جەنگی یەمامەدا دژ بە هەڵگەڕاوەکان بەشداری کردو تیایدا شەهید بوو.[٣]

لە رۆژی یەمامەدا ئاڵای پشتیوانان لە دەستی ثابتی کوڕی قەیسدا بوو.[٤]

ثابت لە رۆژی یەمامەدا کاتێك دەیبینی موسڵمانان کەمتەرخەمیەکیان هەبوایە هاواری دەکرد خوایە لای تۆ خۆم دوور دەگرم لەوەی ئەوانە دەیکەن- واتە مەبەستی بێباوەڕەکان بوو- کە دژ بە موسڵمانان دەجەنگان و دەیانویست ئیسلام لەناوبەرن، هەروەها وتی خوایە لای تۆ خۆم دوور دەگرم

١ - أسد الغابة، ج١، ص ٣٣٩.

٢ - أسد الغابة، ج١، ص ٣٣٩.

٣ - أسد الغابة، ج١، ص ٣٣٩.

٤ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ٣٢٤.

لەوەی ئەمانەش دەیکەن–واتە موسڵمانان– چونکە هەندێ لە موسڵمانان لە کشانەوەو خۆدزینەوەدا بوون، ئینجا ثابت بە سەختی جەنگا تا شەهید بوو.[١]

بەسەرهاتێك سەبارەت بە رووداوی دوای کوژرانی هاتووە کە دەڵێت کاتێك ثابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس کوژرا قەڵغانێکی گرانبەهای لەبەر بوو، کەسێك لە موسڵمانان هات و بردی بۆ خۆی، دواتر ثابت چووە خەوی موسڵمانێك و پێی وت وەسیەتێکت بۆ دەکەم تکام وایە نەڵێیت خەوەو پشتگوێیی بخەیت، من کە دوێنێ کوژرام کەسێك لە موسڵمانان هات و قەڵغانەکەی بردم و ماڵیشی لەوپەڕی شارەوەیە و لەوێ بەوجۆرە شاردوویەتیەوە، بڕۆ بۆ لای خالید و داوای لێ بکە تا کەسێك بنێرێت ئەو قەڵغانەم وەربگرێتەوە، کە چوویتەوە مەدینە بیبە بۆ لای خەلیفەی پێغەمبەر (ﷺ) و پێی بڵێ من فڵانە قەرز و فڵانە قەرزم لەسەرە و فڵانە کۆیلەشم با ئازاد بێت، ئەوەبوو کابرا چوو و وایکرد و خەلیفەش وەسیەتەکەی بەجێگەیاند، ئەوەش تاکە وەسیەتی پاش مەرگە کە جێبەجێ کرابێت.[٢]

١ - أسد الغابة، ج١، ص ٣٤٠.

٢ - أسد الغابة، ج١، ص ٣٤٠، البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ٣٣٥.

## چواردەهەم: ماڵئاوایی جەعفەری کوڕی ئەبووتالیب (رضي الله عنه)

جەعفەری کوڕی ئەبووطالیبی هاشمی، ئامۆزای پێغەمبەری خوایە (ﷺ)، کونیەکەی ئەبووعەبدوڵایە، یەکێکە لە یەکەمین دەستەی موسڵمان بوان.

جەعفەر هەر لە قۆناغی مەککەو لە سەرەتاوە موسڵمان بوو، دەوترێت بیست و شەشەمین کەس بووە موسڵمان بووە، رایەکی تر دەڵێت سی و دووەم کەس بووە موسڵمان بووە.

ئەبووهورەیرە دەیوت دوای پێغەمبەر (ﷺ) جەعفەر چاکترین کەس بوو، هەروەها دەیوت جەعفەر چاکترین کەس بوو بۆ هەژاران، لەگەڵ هەژاراندا هەڵسوکەوتی دەکرد و خزمەتی هەژارانی دەکرد و ئەوانیش خزمەتیان دەکرد، ئیتر وای لێهات پێغەمبەر (ﷺ) بە ئەبولمەساکین (باوکی هەژاران) ناوی دەبرد.[1]

جەعفەر لەرووی شێوەی روخساری و پەیڕەوی رەوشتیەوە زۆر لە پێغەمبەر (ﷺ) دەچوو، پێغەمبەر (ﷺ) پێی دەفەرموو (أشبهت خلقي و خلقي)،[2] (لە شێوەو روخسارو رەوشتدا لە من دەچیت).

١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٨٦.

٢ - صحيح البخاري، الرقم ٢٥٧٣، صحيح ابن حبان، الرقم ٤٩٥١.

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت کاتێك جەعفەر و یارانی گەیشتنە مەدینە، پێغەمبەر (ﷺ) نێوچاوانی جەعفەری ماچ کرد،[١] ئینجا فەرمووی نازانم بە کامیان دڵخۆش بم، بە هاتنی جەعفەر یان بە فەتحی خەیبەر.[٢]

ماوەیەکی کەم دوای ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) جەعفەری کوڕی ئەبووطالیبی نارد بۆ شەڕی موئتە لە خاکی شام، ئەوەبوو لە مانگی جەمادیلئوولای ساڵی هەشتەمی کۆچیدا لەو غەزایەدا شەهید بوو.

موئتە لە خوارووی بەلقا بوو ماوەیەك دوور بوو لە شام، ئەوەبوو لە مانگی جەمادیلئوولادا پێغەمبەر (ﷺ) بە نامەیەکەوە حارثی کوڕی عومەیری ئەزدی نارد بۆ لای پاشای بوصرا، کەچی کە گەیشتە موئتە شورەحبیلی کوڕی عەمری غەسانی رێی پێ گرت و کوشتی، پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی لەسەر سەخت بوو، بۆیە سوپایەکی نارد کە نزیکەی سێ هەزار کەس دەبوون، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ئەمیری خەڵکەکە زەیدی کوڕی حارثەیە، ئەگەر کوژرا ئەوە جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب ئەمیرە، ئەگەر ئەویش کوژرا ئەوە عەبدوڵای کوڕی رەواحە ئەمیرە، ئەگەر ئەویش کوژرا با موسڵمانان بە رەزامەندی خۆیان لەنێو خۆیاندا کەسێك دیاری بکەن و بیکەنە ئەمیریان)، پێغەمبەر (ﷺ) ئاڵایەکی

---

١ - سنن أبي داود، الرقم ٤٥٦٤، البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ٢٠٦.

٢ - السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٢٦٩٧، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٤٥٣،مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ٣١٥٦٧، مسند البزار، الرقم ١٩٨١، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٣٥١، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤١٩٣، صححه الذهبي في تعليقاته على المستدرك،

سپی دایە دەست زەیدی کوڕی حارثەو وەسیەتی کرد بۆیان تا بچنە شوێنی کوژرانەکەی حارثی کوڕی عومەیر و خەڵکی ئەوێ بانگ بکەن بۆ ئیسلام، ئەگەر موسڵمان بوون باشە، ئەگەرنا پشت بەخوا ببەستن و دژیان بجەنگن، خۆیشی بۆ بەڕێکردنیان لەگەڵیان چوو تا گەیشتە (ثنیة الوداع)، ئیتر لەوێ وەستا و ماڵئاوایی کرد لێیان، موسڵمانانیش نزایان دەکرد بۆیان و دەیانوت خوا بتانپارێزێ و بە چاکی و دەستکەوتەوە بتانگێڕێتەوە، دوژمنیش ئەم هەواڵەی بیست و سوپای کۆکردەوەو شورەحبیل نزیکەی سەد هەزار سەربازی کۆکردەوەو دەستەی پێشڕەوی نارد.

کاتێك موسڵمانان گەیشتنە خاکی شام و هەواڵی زۆری سوپای دوژمن و هاتنی هیرەقلیشیان بە سوپایەکەوە بیست کە نزیك لەو ناوچە بوو، وتیان با نامە بنێرین بۆ پێغەمبەر (ﷺ) تا بزانین فەرمان بە چی دەکات، بەڵام عەبدوڵای کوڕی رەواحە موسڵمانانی هاندا تا درێژە بدەن بە چوونەکەیان، ئەوەبوو درێژەیان دا بە چوونەکەیان تا گەیشتنە موئتە، دوژمنیش بە سوپایەکی گەورەوە هاتن و جەنگ لەنێوانیاندا روویدا، زەید بە ئاڵاکەوە جەنگا تا رمێکی بەرکەوت و شەهید بوو، ئینجا جەعفەری کوڕی ئەبووطالیب ئاڵاکەی گرتەدەست و لەسەر ئەسپەکەی دابەزی و دەمارێکی پێی ئەسپەکەی بڕی تا نیشانی بدات راکردن نیە، ئینجا جەنگا تا سەربازێکی رۆمی بە شمشێر لێیدا و وا لێیدا کردی بە دوو بەشەوە، یەکێك لە بەشەکانی جەستەی نزیکەی سی و ئەوەندە برینداری پێوە بوو، بە هەموو جەستەیەوە نزیکەی حەفتاو ئەوەندە

برینداری بینرا چ لە بەرکەوتنی  شمشێر یان رم بێت، ئینجا عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە ئاڵاکەی هەڵگرت و ئەویش جەنگا تا کوژرا، ئینجا موسڵمانان ئاڵاکەیان دایە دەست خالیدی کوڕی وەلید و ئەویش بە پلانێکی سەرکەوتوو توانی پاشەکشە بکات بە سوپای موسڵمانان.[١]

کاتێك جەعفەر ئاڵاکەی بەدەستی راستەوە گرتبوو شمشێرێك درا لە دەستی و دەستی بڕا، بۆیە بە دەستی چەپ ئاڵاکەی گرتە دەست، پاش کەمێکی تر درا لە دەستی چەپیشی و هەردوو دەستی بڕا.[٢]

کاتێك ئەم رووداوانە روویاندەدا پێغەمبەر (ﷺ) لە مەدینە لەلایەن پەروەردگارەوە هەواڵی پێدەدراو دەیگێڕایەوە بۆ هاوەڵان.[٣]

ئەسمائی ژنی جەعفەر دەڵێت جارێك هەویرم شێلا بوو و منداڵەکانم شۆردبوون و رۆنم دابوو لە قژیان و پاکو پوختم کردبوونەوە، پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆ لامان و فەرمووی (منداڵەکانی جەعفەرم بۆ بهێنە)، منیش ئەوانم هێنا، پێغەمبەریش (ﷺ) بۆنی ئەوانی دەکرد و فرمێسك بە چاوانیدا دەهاتە خوارەوە، وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە دایك و باوکمەوە بە قوربانت بم بۆچی دەگریت، ئایا هیچت سەبارەت بە جەعفەر و هاوەڵانی بیستووە؟ فەرمووی (نعم أصیبوا هذ الیوم)، (بەڵێ ئەمڕۆ کوژران)، ئەسمائی کچی

١ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ١٢٨-١٢٩.
٢ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ٢٤٦.
٣ - المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٣٨٤٣.

عومەیس دەڵێت منیش هەستام دەستم کرد بە شیوەن و ژنان لە دەورم کۆبوونەوە و پێغەمبەر (ﷺ) گەڕایەوە بۆ ماڵەوەو بە ژن و خێزانەکانی فەرموو (لا تغفلوا آل جعفر من أن تصنعوا لهم طعاما فإنهم قد شغلوا بأمر صاحبهم)،[1] (بنەماڵەی جەعفەر پشتگوێ مەخەن و چاوتان لێیان بێت خواردنیان بۆ ئامادە بکەن چونکە ئەوان خۆیان پەشۆکاون بە مردووەکەیانەوە).

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە پێغەمبەر (ﷺ) بە خەڵکی فەرموو (اصنعوا لآل جعفر طعاما فإنه قد أتاهم أمر شغلهم)،[2] (خواردنێك ئامادە بکەن بۆ خێزانی جەعفەر چونکە بارێکیان تووش بووە کە پەشۆکاوی کردون).

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی کوژرانی جەعفەر و زەید و عەبدوڵای کوڕی ڕەواحەی بیست، دانیشت و خەفەت دەموچاوی داگرتبوو، پیاوێك هات وتی ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئافرەتانی جەعفەر وا دەگرین و بەردەوامن لە گریانیان، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد بڕوات ڕێی گریانیان لێ بگرێت، ئەویش چوو و هاتەوەو وتی ئەی پێغەمبەر (ﷺ) من پێم وتن بەڵام بەگوێیان نەکردم، پێغەمبەر (ﷺ) هەمتر ناردیەوە، کابرا چوو و هاتەوەو وتی بەخوا چاریان

١ - مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٦٤٧٥، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٢٠٢٣٤، ضعفه شعيب الأرناؤوط.

٢ - سنن أبي داوود، الرقم ٢٧٤١، سنن ابن ماجة، الرقم ١٦٠٥، المستدرك على الصحيحين، الرقم ١٣١١، سنن الدارقطني، الرقم ١٦١٥، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ٦٦٩٠، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٦٨٥، مسند الشافعي، الرقم ١٥٤٤، مسند الطيالسي، الرقم ١٠١٤، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم ٦٦٥٠، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٤٥٦، حسنه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داوود، الرقم ٣١٣٢، كما حسنه شعيب الأرناؤوط في تعليقه على مسند أحمد بن حنبل.

ناکەم هەر دەگرین، جاری سێیەمیش هەر وا بوو، عائیشە دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) بە کابرای فەرموو (فاحث في أفواههن التراب)، (دەی خۆڵ بپرژێنە بە دەموچاویاندا).[1]

پێغەمبەر (ﷺ) تا سێ ڕۆژ مۆڵەتی دا خێزانی جەعفەر ماتەمینی بگێڕن، دواتر پێغەمبەر (ﷺ) چوو بۆ لایان و فەرمووی (لا تبكوا على أخي بعد اليوم)، (لەمڕۆ بەدواوە مەگرین بەسەر براکەمدا)، ئینجا فەرمووی (برازاکانم بۆ بانگ بکەن)، ئەوانیش هاتن، ئینجا داوای سەرتاشی کرد و سەرتاش هات، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد سەری کوڕەکانی جەعفەری چاك کرد.[2]

پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو (رأيت جعفرا يطير في الجنة مع الملائكة)،[3] (جەعفەرم بینی لە بەهەشتدا لەگەڵ فریشتەکاندا دەفڕی).

---

١ - صحيح البخاري، الرقم ١٢٥٠، صحيح مسلم، الرقم ١٦٠٢، صحيح ابن حبان، الرقم ٣٢٠٤، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ١٩٥٣، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ٦٦٧٨، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٣٧٥٥.

٢ - سنن أبي داوود، الرقم ٣٦٧٨، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٨٣٣٠، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٦٨٤، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٤٤٥، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن النسائي، الرقم ٥٢٢٧.

٣ - سنن الترمذي، الرقم ٣٧٨٢، صحيح ابن حبان، الرقم ٧١٥٦، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن الترمذي، الرقم ٣٧٦٣.

## پانزەهەم: ماڵئاوایی حەنظەلە (رضي الله عنه)

حەنظەلەی کوڕی ئەبی عامیر لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان،[١] ناسراوە بە غەسیلولمەلائیکە، چونکە کاتێك شەهید بوو فریشتەکان ئەویان شۆرد.[٢]

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) دەرکەوت، ئەبی عامیری باوکی بڕوای پێ نەهێنا و لە مەدینە دەرچوو و چوویە ناو ریزی قورەیش و لە جەنگی ئوحوددا دژ بە پێغەمبەر (ﷺ) جەنگا و دواتریش گەڕایەوە بۆ مەککەو دواتر لەوێوە چوو بۆ وڵاتی رۆم و لەوێ مایەوە تا لە ساڵی نۆ یان دەی کۆچیدا بە بێباوەڕی مرد،[٣] لەبەرئەوەی وا دەستبەرداری حەق بوو و لە دەست ئیسلام رایکرد پێغەمبەر (ﷺ) ناوی نابوو فاسق.[٤]

بەڵام حەنظەلەی کوڕی موسڵمان بوو و بە جوانیش موسڵمان بوو.[٥]

---

١ - الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٣٨٠.

٢ - صحيح ابن جبان، الرقم ٧١٣٥، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٨٧٠ سكت عنه الذهبي في التلخيص، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ٦٤٢٦، صححه شعيب الأرناؤوط، حسنه الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة، الرقم ٣٢٦.

٣ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٣٧.

٤ - البدايةو النهاية لابن كثير، ج٤، ص ٢١.

٥ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٣٧.

ژنەکەی حەنظەلە ناوی جەمیلەی کچی ئوبەی کوڕی سەلوول بوو،[١] لەم ژنەی منداڵیکی بوو بە ناوی عەبدوڵا، بەڵام کوڕەکەی خۆی نەدی، چونکە ئەو شەوەی چوویە لای ژنەکەی، بۆ بەیانیەکەی شەهید بوو، ئەوەبوو پاش نۆ مانگ لە شەهیدبوونی ئەم منداڵەی لەدایك بوو.[٢]

قەدەری خوا وابوو حەنظەلە کوڕی بێباوەڕێکی لاسار بوو کە دوژمنایەتی پێغەمبەری خوای (صلى الله عليه وسلم) هەڵبژاردبوو، جەمیلەش کچی سەرگەورەی دووڕووەکان بوو، ئەم دوو پاکە بەیەکگەیشتن و نەوەیەکی پاکیان لێکەوتەوە.

حەنظەلە لە جەنگی ئوحوددا بەشداری کرد، واتە دژ بە بەرەکەی باوکی وەستا و ریزی پێغەمبەری خوای (صلى الله عليه وسلم) دژ بە باوکی هەڵبژارد، لە غەزای ئوحوددا بەشداریەکی کارای کرد و تیایدا شەهید بوو.[٣]

پێش جەنگی ئوحود حەنظەلە و عەبدوڵای کوڕی عەبدوڵای ئوبەی کوڕی سەلوول-کە ژنبرای حەنظەلە بوو- هاتن بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، داوایان لێکرد مۆڵەتیان بدات تا باوکی خۆیان بکوژن، حەنظەلە لەبەرئەوەی بینی باوکی بەرەی دژ بە پێغەمبەری خوای (صلى الله عليه وسلم) گرتووەتەبەر و شمشێری لەدژ هەڵکردووە، عەبدوڵاش لەبەر ئەوەی بینی باوکی بووەتە ڕێبەری دووڕووان و دژ

١ - الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٤، ص ١٨٠٢.

٢ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٦٦.

٣ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٣٧.

بە پێغەمبەر(ﷺ) خەبات دەكات، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ڕێی نەدا بە هیچكامیان.[١]

شەوێك پێش غەزای ئوحود حەنظەلە ژنی گواستەوە، حەنظەلە پێشتر داوای مۆڵەتی كرد لە پێغەمبەر(ﷺ) تا شەو لای ژنەكەی بێت چونكە دەیگوازێتەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) مۆڵەتی پێدا،[٢] پاش نوێژی بەیانی هەمدی چوویەوە لای جەمیلەی ژنی و جیماعیان كرد، دواتر كە گوێی لە بانگەوازی جیهاد بوو چوو خۆی گەیاند بە سوپاكەی پێغەمبەر(ﷺ)،[٣] پێش ئەوەی بكەوێتەڕێ جەمیلەی ژنی چوار كەس لە هۆزەكەی خۆی بانگ كرد و كردنی بە شاهید كە حەنظەلە چووەتە لای، ئەوانیش لێیان پرسی بۆچی شاهیدت لێگرت؟ جەمیلە وتی خەوم بینی ئاسمانی بۆ كراوەو حەنظەلە چوویە ئاسمان و دواتر ئاسمان داخرایەوە، منیش وتم ئەمە شەهیدبوونی حەنظەلەیە، بۆیە شاهیدم لەسەر گرت كە هاتوەتە لام، ئەوەبوو دواتر سكی كرد.[٤]

---

١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٣٧.

٢ - دلائل النبوة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٤٠٦.

٣ - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٨٦٩، قال الذهبي إسناده مظلم.

٤ - دلائل النبوة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٤٠٦.

حەنظەلە کە گەیشتە ئوحود بینی پێغەمبەر(ﷺ) سەرقاڵە ریزەکانی سوپاکەی ڕێك دەکات،[١] کاتێك جەنگ ڕوویداو موسڵمانان لە ئوحوددا شکان و دواتر گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، حەنظەلە ڕێی کەوتە ئەبووسوفیان و ویستی بیکوژێت و خەریك بوو بیکوژێت، بەڵام لەو کاتەدا شەدادی کوڕی ئەسوەد-یان کوڕی ئەوس[٢]- هات و حەنظەلەی شەهید کرد،[٣] پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی فریشتەکان حەنظەلەی هاوڕێتان دەشۆن، ئادەی بڕۆن پرسیار بکەن لە ژنەکەی، کاتێك پرسیاریان کرد لە ژنەکەی، ئەویش وتی حەنظەلە کاتێك هاواری جیهادی بیست لەشی گران بوو، بۆیە بە لەشگرانیەوە چوو بۆ جیهاد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی دەی ئەوەیە فریشتەکان شۆردیان.[٤]

کاتێك حەنظەلە گەیشت بە ئەبوو سوفیان، ئەبووسوفیان لەسەر ئەسپێك بوو، حەنظەلە بە شمشێرەکەی دای لە ئەسپەکەی و ئەبووسوفیان کەوتە سەر زەوی، ئەبووسوفیان هاواری دەکرد ئەی گرۆی قورەیشیەکان ئەمە منم ئەبووسوفیانی کوڕی حەرب، حەنظەلەش دەیویست بە شمشێرەکەی گەردنی

---

١ - السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٦٨٧١.

٢ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ٢١.

٣ - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٨٧٠.

٤ - صحيح ابن جبان، الرقم ٧١٣٥، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٨٧٠ سكت عنه الذهبي في التلخيص، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ٦٤٢٦، صححه شعيب الأرناؤوط، حسنه الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة، الرقم ٣٢٦.

لێبکاتەوە، بڕێ لە قورەیشیەکان دەنگی ئەبووسوفیانیان بیست و لەتاو سەختی جەنگەکە نەچوون بە دەمیەوە،[١] بەڵام شەداد چوو بە دەمیەوە،[٢] بە رمێك دای لە حەنظەلەو رمەکە لە پشتیەوە دەرچوو و ئەبوو سوفیانیش رایکرد.[٣]

بێباوەڕەکانی قوڕەیش تەرمی شەهیدانی ئوحودیان دەشێواندن، تەنها تەرمی حەنظەلەیان نەشێواند چونکە باوکی لەناو سوپای قوڕەیشیەکاندا بوو و بۆ دڵراگرتنی باوکی دەستکاری تەرمەکەی ئەویان نەکرد،[٤] دەشوترێت بەڵکو ئەبی عامیری باوکی لەسەر تەرمی کوڕەکەی وەستا و بە قاچی پاڵی نا بە سنگی کوڕەکەیەوەو وتی دوو قەرزم لەسەرە، من پێشتر هاتمە سەر لاشەکەت ئەی پیس و بۆگەن، هەروەها سوێند بەخوا تۆ لەگەڵ باوکتدا زۆر چاکەکار بوویت.[٥]

---

١ - السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٦٨٧١.

٢ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ٢١.

٣ - السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٦٨٧١.

٤ - أسد الغابة، ج٢، ص ٦٨.

٥ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ١٧٩.

## شانزەهەم: ماڵئاوایی خوبەیبی کوڕی عەددی (رضي الله عنه)

خوبەیبی کوڕی عەددی یەکێکە لە پشتیوانان لە ئەوسیەکان،[١] هەروەها یەکێکە لە بەشداربوانی غەزای بەدر.[٢]

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دە کەسی لە هاوەڵانی بە سریەیەك نارد، عاصیمی کوڕی ثابتی ئەنصاری کرد بە ئەمیریان، کە گەیشتنە ناوچەیەکی نێوان عوسفان و مەککە، دەستەی بەنوولیحیان بە نزیکەی دووسەد کەسەوە هاتن و کەوتنە شوێنیان، کە گەیشتنە شوێنەکەیان بینییان ناوکی خورما جێماوە، وتیان ئەم ناوکە هی خورمای مەدینەیە، بۆیە کەوتنە شوێنیان، کاتێك عاصیم و هاوەڵەکانی ئەوانیان بینی هەستیان بە مەترسی کرد و لە شوێنێك خۆیان پەنا دا، بەڵام بەنولیحیان گەمارۆیان دان و وتیان خۆتان بدەن بە دەستەوە لە پەنادا دەبن و کەستان ناکوژین، عاصمی ئەمیری سریەکە وتی بەخوا من خۆم نادەمە بەر پەنای بێباوەڕ، خوایە هەواڵی ئێمە بگەیەنەرە پێغەمبەرەکەت، ئەوەبوو بەنولیحیان تیربارانیان کردن، ئەوەبوو عاصم و حەوت کەسی تریان شەهید بوون، سێ کەسەکەی تر کە مابوونەوە خۆیان دا بە دەستەوەو داوای پەنایان کرد، یەکێك لەو سێ کەسە خوبەیب بوو، کاتێك گەیشتنە لای بەنولیحیان خێرا ئەوانیان بەستنەوە، یەکێك لە سیانەکە وتی ئەمە سەرەتای ناپاکیەکەیانە، بەخوا من لەگەڵتان نایەم، ئەو کوژراوانەمان پێشەنگی رەوان،

---

١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٦٢.

٢ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٦٢.

ئەوانیش بە زۆر رایاندەکێشا تا لەگەڵیان بچێت بەڵام ئەو نەدەچوو، بۆیە ئەویشیان کوشت، ئینجا خوبەیب و ئەو کەسەکەی تریان برد و ئەوانیان فرۆشتن بە خەڵکی مەککە، ئەوەبوو بەنو حارثی کوڕی عامیر خوبەیبیان کڕی، چونکە خوبەیب لە جەنگی بەدردا باوکی ئەوانی کوشتبوو، خوبەیبیان کڕی و بە دیلی لای خۆیان هێشتیانەوە، لە ماڵەوە لە شوێنێك بەندیان کردبوو تا ئەو کاتەی بیکوژن، خوشکەکەیان لەوێ پاسەوانی بوو، خوبەیب داوای گوێزانی لەو ئافرەتە کرد تا خۆی پێ پاك بکاتەوە، کوڕێکی ئەو ئافرەتەش لای خوبەیب بوو، خوبەیب لەسەر ئەژنۆی خۆی داینیشاندبوو، ئافرەتەکە دەیوت منیش ترسام بە مووسەکە ئەو کوڕەم ئازار بدات، بۆیە بە ترسەوە بەرەو ئەوێ چووم، خوبەیب کە منی بینی زانی ترساوم، وتی ترسایت ئەم منداڵە بکوژم؟ من شتی وا ناکەم، ئافرەتەکە دواتر دەیوت بەخوا هیچ بەندیەکم نەدیبوو هێندەی خوبەیب چاك بێت، سوێند بەخوا رۆژێك بینیم هەرچەندە لای ئێمە بەندکراو بوو کەچی ترێی دەخوارد لەکاتێکدا بە زنجیر بەسترابوویەوە و لەو کاتەشدا لە هەموو مەککە ترێ دەست نەدەکەوت، بۆیە دڵنیام ئەوە رۆزیەکی خوایی بوو ناردبووی بۆ خوبەیب،[١] ئەوان خوبەیبیان بە بەند کراوی هێشتەوە تا مانگە حەرامەکان تەواو بوون،[٢] خوبەیب بە یەکێك لەوانەی وت کە بەندیان کردبوو سێ داواکاریم لێت هەیە، ئاوی سازگارم بۆ بهێنیت و گۆشتی بە حەرام سەربڕاوم بۆ

---

[١] - صحيح البخاري، الرقم ٢٩٠١، سنن أبي داود، الرقم ٢٣٠١

٢ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ٦٧.

نەهێنیت (گۆشتی قوربانی کراو بۆ بتەکان) ئەگەریش ویستیان بمکوژن پێم بڵێیت،[١] ئینجا هاتن و خوبەیبیان برد تا بیکوژن، خوبەیب وتی دەرفەتم بدەن تا دوو رکات نوێژ بکەم، ئەوانیش مۆڵەتیان دا، خوبەیب دوو رکات نوێژی کرد، دواتر کە تەواو بوو تی ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە وابزانن لە ترسا نوێژەکەم درێژ دەکەمەوە زۆر نوێژەکەم درێژە پێدەدا،[٢] ئەمەش بوو بە یەکەم سوننەتی دوو رکات نوێژی پێش کوشتنی موسڵمانان کە خوبەیب ئەنجامی دا، ئینجا نزای کرد لێیان و وتی خوایە هەموویان کۆکەرەوەو بە جارێ لەناویان بەرەو تاقیان مەهێڵە،[٣] ئینجا ئەم شیعرەی وت:

ولست أبالی حین أقتل مسلما

علی أی شق کان لله مصرعی[٤]

هیچ باکم نیە وەك موسڵمانێ کاتێ دەکوژرێم

لەبەرخـودایە، بەهەر جـۆرێ بێ با لەنـاو ببرێـم

---

١ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٢٤٨.

٢ - صحيح البخاري، الرقم ٢٩٠١، سنن أبي داود، الرقم ٢٣٠١.

٣ - صحيح البخاري، الرقم ٣٧٨٨، مسند احمد بن حنبل، الرقم ٧٧٢٢، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٥١٤٣.

٤ - صحيح ابن حبان، الرقم ٧١٤٩.

جۆری کوشتنەکەی بە وجۆرە بوو لەخاچدرا و ئینجا لێی دەدرا تا دەمرد،[١] کاتێك بەرزیان کردەوە بۆ سەر دارخورماکە تا بیبەستنەوە خوبەیب ئەم شیعرەی دەوت:

هــــەمـوان لە دەورم تینیـــان گرتــووە
هۆز و دەستەکـان پـــەنگیـان خواردووە
ژن و منـــدالّیــان خـــڕ بــوون لەو لاوە
منیــش هەڵــواســراو بە دار خــورمــاوە
نـــاڵـــەی بێکەســی و ئاهــی هەر ژانــیّ
بــۆ ئـــەم کوشتنـــەم خودا دەیــزانـــیّ
پەروەردگارم! صەبرێکــم هــەبیّ
بـــۆ مەرگیّ کـــە وان لـــە منیان دەویّ
ئـــــەمــــەش لەپێنــاو پــەروەردگــاریّ
بۆ جەستەی لەت بووم گەر ویستی هەبیّ
خـــۆی دەیپارێـــزیّ و رێــزی لیّ دەنیّ[٢]

١ - صحيح البخاري، الرقم ٢٩٠١، سنن أبي داود، الرقم ٢٣٠١، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٨٥٦٥،

٢ - المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٥١٤٣، ئەگەرچی وتەکان دەقی تەواوی عەرەبیەکە نین، بەڵام کرۆکی واتای عەرەبیەکەن، بۆیە کردمان بە کوردی تا خوێنەر ئاهی سەرەمەرگی ئەو هاوەڵە تێبگات.

ئینجا خوبەیب وتی: خوایە وا ئێمە پەیامی پێغەمبەرەکەتمان گەیاند، دەی تۆیش هەواڵی ئێمە بە پێغەمبەرەکەت بگەیەنە.[١]

جا لەو کاتەی تیریان بۆ دەهاویشت پێیان دەوت حەزت ئەکرد ئێستا موحەممەد لە شوێنی تۆدا بێت؟ ئەویش دەیوت نە سوێند بە خوای گەورە، حەز ناکەم لە بری ئەم لەناوچوونەی من دڕکێکیش بچێت بە پێیدا، ئەوانیش پێدەکەنین.[٢]

کاتێك خوبەیب کوژرا دەموچاوی خوبەیبیان بە پێچەوانەی کەعبەوە وەرچەرخاند، کەچی دواتر تەماشایان کرد دەموچاوی روو بە کەعبەیە، چەند جار وایان لێکرد کەچی هەر دەموچاوی رووی دەکردەوە بەرەو قیبلە، بۆیە وازیان لێهێنا.[٣]

موعاویەی کوڕی ئەبوو سوفیان دەڵێت: من ئەو رۆژە ئامادەی کوشتنەکەی خوبەیب بووم، لە ترسی نزاکەی خوبەیب وام دەزانی زەوی قووتم دەدات.[٤]

پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە هەواڵی خوبەیبی پێ گەیشت، هەریەك لە میقداد و زوبەیری نارد تا تەرمی خوبەیب لە دارخورماکە دابگرن، کە گەیشتنە ناوچەی تەنعیم دەبینن چل کەس لەوێن، هەرچۆنێك بێت تەرمەکەی خوبەیبیان داگرت،

---

١ - حلية الاولياء، ج١، ص ١١٣.

٢ - المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٥١٤٣.

٣ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٦٣.

٤ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ٦٦.

زوبەیر تەرمەکەی خستە سەر ئەسپەکەی و تەرمەکەشی هیچ تێك نەچووبوو، بەڵام بێباوەڕەکان پێیان زانین، کاتێك کەوتنە شوێنیان زوبەیر تەرمەکەی خستە خوارەوە، زەوی تەرمەکەی خوبەیبی قووتدا و تەرمەکەی دیار نەماو نەکەوتە دەست بێباوەڕان.[1]

رایەکی تر دەڵێت: بەڵکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەنها عەمری کوڕی ئومەییەی نارد تا تەرمەکەی خوبەیب ببات، ئەویش چوو و تەرمەکەی خوبەیبی خستەخوارەوە، زەوی تەرمەکەی خوبەیبی قووت دا، دواتر کەمێك گەڕام بۆ تەرمەکە لە هیچ شوێنێك تەرمەکە دیار نەبوو، تا ئێستاش تەرمی خوبەیب دیار نیە.[2]

١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٦٣.

٢ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ٦٧.

## حەڤدەهەم: ماڵئاوایی روقییەی کچی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

روقییە کچی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بوو، روقییە هاوسەری کوڕێکی ئەبوو لەهەب بوو کە ناوی عوتبە بوو، ئەمەش پێش ماوەی پێغەمبەرایەتی بوو، بەڵام کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سروشی بۆ هات و ئەبوولەهەب دژایەتی کرد، فەرمانی کرد بە کوڕەکەی تا روقییە تەڵاق بدات، ئەوکات هێشتا روقییە نەگوازرابوویەوە، ئەوەبوو تەڵاقی دا، دواتر عوثمانی کوڕی عەففان روقییەی بەهاوسەر گرت و لەگەڵیدا خۆشی و ناخۆشیەکانی بەشکرد، پێکەوە کۆچیان کرد بۆ حەبەشەو پێکەوە گەڕانەوەو کۆچیان کرد بۆ مەدینەو لە مەدینەش تا وەفاتی روقییە عوثمان هەر لە لای روقییە بوو.[1]

کاتێك عوثمان و روقییە کۆچیان کرد بۆ حەبەشە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ماوەیەك هەواڵی ئەوانی نەزانی، هەوڵی دەدا هەواڵیان بزانێت، ئەوەبوو ئافرەتێك هات بۆ لای و هەواڵی عوثمان و روقییەی پێ بوو، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (إن عثمان أول من هاجر إلى الله بأهله بعد لوط)،[2] ( عوثمان یەکەم کەسە دوای پێغەمبەر لووط لەپێناو خوادا بە خۆیو ژنیەوە کۆچی کردبێت).

روقییە لە عوثمانی کوڕی عەففان کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدوڵا، بەڵام ئەو کوڕەی مرد و ئیتر دوای ئەوە روقییە منداڵی تری نەبوو،[3] عەبدوڵای کوڕی

١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٤٨-٦٤٩.

٢ - المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٤١.

٣ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٤٨-٦٤٩.

تەمەنی گەیشتبوویە شەش ساڵان کە کەڵەشێرێك دەنووکی دا لە دەموچاوی و مرد.[١]

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) دەرچوو بۆ غەزای بەدر روقییە نەخۆش بوو، بۆیە عوثمانی کوڕی عەففان لای روقییەی خێزانی مایەوە، ئەو رۆژەی زەیدی نێردراوی پێغەمبەر (ﷺ) بە موژدەوە هاتەوە بەرەو مەدینە تا هەواڵی سەرکەوتنی بەدر بدات، روقییە کۆچی دوایی کرد.[٢]

مانەوەی عوثمان لای روقییەو نەچوونی بۆ غەزای بەدر بە فەرمانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو.[٣]

کاتێك عوثمان و هاوەڵان سەرقاڵی ئەسپەردەکردنی تەرمی روقییە بوون، عوثمان دەنگێکی الله أكبرى بیست، وتی ئەی ئوسامە ئەوە چیە، کە تەماشایان کرد زەیدی کوڕی حارثەیە لەسەر وشترەکەی پێغەمبەری خوایە(ﷺ) و هەواڵی شکستی بێباوەڕانی پێیە.[٤]

کاتێك روقییە وەفاتی کرد پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (الحقي بسلفنا عثمان بن مظعون)، (پەیوەست بە بە پێشینمان عوثمانی کوڕی مەظعوون)، پێشتر کە عوثمانی کوڕی مەظعوون وەفاتی کردبوو، ژنەکەی وتی بەهەشتت لێ پیرۆز

١ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٥١.
٢ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٤٩.
٣ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص ٣٤٧.
٤ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٤٩.

بێت، پێغەمبەر (ﷺ) بە توورەییەوە تەماشای کرد و فەرمووی: تۆ چووزانیت؟ ئەویش وتی ئەو سوارچاك و هاوەڵی تۆ بوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (سوێند بەخوا نازانم چی پێ دەکرێت)، ئیتر هاوەڵان ئەوەیان زۆر لەسەر سەخت بوو کە چۆن پێغەمبەر (ﷺ) بۆ عوثمان وای فەرموو، بەڵام کاتێك روقییە مرد و پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی فەرموو ئیتر هاوەڵان تێگەیشتن.[١]

ژنان بۆ مەرگی روقییە دەگریان و عومەری کوڕی خەتتابیش رێگری دەکرد لێیان، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: وازبێنە ئەی عومەر، پاشان فەرمووی: (إياكن ونعيق الشيطان، فإنه مهما يكون من العين والقلب فمن الرحمة، وما يكون من اللسان واليد فمن الشيطان)، (خۆدوور بگرن لە قیژەی شەیتان، چونکە تا لە چاو و دڵەوە بێت ئەوە لە رەحم و سۆزەوەیە، ئەوەش لە زمان و دەستەوە بێت ئەوە لە شەیتانەوەیە)، فاطیمەی خوشکی لە کەناری گۆڕی روقییەوە بۆ روقییەی خوشکی دەگریا، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) بە لایەکی جلەکەی فرمێسکی چاوانی فاطیمەی دەسڕی.[٢]

لەبەرئەوەی کاتێك روقییە وەفاتی کرد پێغەمبەر (ﷺ) لە بەدر بوو، دیارە ئەو رووداوانە دوای هاتنەوەی بووە لە بەدر.

---

١ - المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٨١٩٣، مسند الطيالسي، الرقم ٢٨٠٧.

٢ - مسند الطيالسي، الرقم ٢٨٠٧، قال الذهبي هذا منكر.

## هەژدەهەم: ماڵئاوایی زەیدی کوڕی ثابت (رضي الله عنه)

زەیدی کوڕی ثابت لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینە زەید موسڵمان بوو، ئەوکات هێشتا تەمەنی یانزە ساڵ بوو.[١]

هەروەها زەید نووسەرەوەی سروش بوو و ماوەیەك موفتی مەدینە بوو و یەکێك بوو لە قورئان خوێنە گەورەکان.[٢]

زەید دەڵێت: من دراوسێی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بووم، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) سروشی بۆ دادەبەزی دەینارد بە شوێنمدا، منیش سروشەکەم بۆ دەنووسیەوە، جا پێغەمبەر (ﷺ) سروشتی وابوو ئەگەر باسی دنیامان بکردایە ئەویش لەگەڵماندا باسی دنیای دەکرد، ئەگەریش باسی قیامەتمان بکردایە ئەویش لەگەڵماندا باسی قیامەتی دەکرد، کاتێك باسی خواردنمان بکردایە باسی خواردنی لەگەڵ دەکردین.[٣]

١ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٢٨.

٢ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٢٧.

٣ - السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٢٤٦٣، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٤٦٤٦، الشمائل المحمدية للترمذي، الرقم ٣٣٥.

جارێك ئیبن عەبباس ڕەشۆی وڵاخەکەی زەیدی گرت ، زەید وتی کەنار بگرە ئەی ئامۆزای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، ئەویش وتی ئێمە بەرامبەر زاناو گەورەکانمان وادەکەین.[١]

سەبارەت بە ساڵی وەفاتی زەید چەند رایەك هاتووە، هەریەك لە ساڵی چل و پێنج و چل و شەش و پەنجاو یەك و پەنجا و پێنج و پەنجاو شەش هاتووە.[٢]

کاتێك زەید کۆچی دوایی کرد مەڕوانی کوڕی حەکەم نوێژی لەسەر کرد و هەرچی ئافرەتی شار بوون ئەوانیش هاتنەدەرەوە، خاریجەی کوڕی ئافرەتانی هۆشیار دەکردەوە تا لەسەر زەید نەگرین، کەچی ئافرەتان دەیانوت قسەکانت ناچنە گوێمان و تا سێ ڕۆژی ماتەمینی بۆ دەگرین.[٣]

مەڕوان فەرمانی کرد وشترێك سەربڕا بۆ دروستکردنی خوان و خەڵکی نانیان خوارد.[٤]

کاتێك زەید کۆچی دوایی کرد، سالم وتی ئەمڕۆ زانای خەڵکی مرد، ئیبن عومەر لەوێ بوو وتی ڕەحمەتی خوای لێ بێت، ئەو لە سەردەمی عومەردا زانای خەڵکی بوو، عومەر زانایانی بە ناوچەکاندا بڵاو دەکردەوەو ڕێگری دەکرد لێیان

---

١ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٣٧.

٢ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٤١.

٣ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٤٠.

٤ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٤٠.

لەخۆوە فەتوا بدەن، زەیدیشی لە مەدینە هێشتەوە تا فەتوا بدات بۆ خەڵکی مەدینە.[١]

ئیبن عەبباس لە کاتی ئەسپەردەکردنی زەیددا وتی ئاوایە مەرگی زانایان، ئەمڕۆ زانستێکی زۆر ژێر گڵ نرا.[٢]

ئەبووهورەیرە وتی ئەمڕۆ مەرەکەبی ئەم ئوممەتە(زانای ئوممەت) مرد بەڵکو خوای گەورە ئیبن عەبباس بکاتە جێگرەوەی.[٣]

١ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٣٤.

٢ - سير أعلام النبلاء، ٢، ص ٤٤٠.

٣ - أسد الغابة، ج٢، ص ٣٣٣.

## نۆزدەهەم: ماڵئاوایی زەیدی کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه)

زەیدی کوڕی خەطاب لە سەری باوکیەوە برای ئەمیری باوەڕداران عومەری کوڕی خەطابە، ئەم هاوەڵە لە کۆچەرانە،[١] زەید براگەورەی عومەر بوو، پێش عومەری برایشی موسڵمان بوو.

زەید لە غەزای بەدرو ئوحود و خەندەق و حودەیبیەو هەموو غەزاکانی دواتریشدا بەشداری کرد.[٢]

لە غەزای ئوحوددا هەریەك لە عومەر و زەید پێکەوە بەشداری غەزاکە بوون، لە گەرمەی جەنگەکەدا بوون کە عومەر قەڵغانەکەی خۆی دا بە زەید و وتی براگیان ئەم قەڵغانە بگرە، زەیدیش وتی منیش هەمان ئەو شەهیدیەم دەوێت کە تۆ دەتەوێت، بۆیە هیچکامیان قەڵغانەکەیان بەکارنەهێنا.[٣]

لە سەردەمی خیلافەتی ئەبووبەکری صدیقدا ئاڵای موسڵمانان بەدەست زەیدەوە بوو، لە جەنگی یەمامەدا بەشداری کرد و تیایدا شەهید بوو.[٤]

کاتێك جەنگەکە دەستی پێکرد، زەید ئاڵاکەی بەدەستەوە بوو و بە سەختی دەجەنگا، کاتێك خەریك بوو موسڵمانان شکستیان دەخوارد، زەید هاواری دەکرد خوایە من لەبەردەمتدا پۆزش دێنمەوە بەرامبەر بەم راکردنەی هاوەڵانم و

---

١ - أسد الغابة، ج٢، ص ٣٤١.

٢ - أسد الغابة، ج٢، ص ٣٤١.

٣ - المعجم الاوسط للطبراني، الرقم ٥٤٠٢.

٤ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٦٠٤.

دوورەپەرێزیش دەنوێنم لەوەی موسەیلەمە دەیڵێت، لەو نێوەندەدا چاوی کەوت بە رەججالی کوڕی عونفوە کە سەرەتا هاتبوو و موسڵمان بووبوو و دواتر هەڵگەڕایەوەو چوویە لای موسەیلەمەو درۆی دەکرد بە دەم پێغەمبەری خواوە (ﷺ) و دەیوت من بیستوومە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: موسەیلەمە لەم پەیامبەریەدا هاوبەشمە، ئیتر ئەوە گەورەترین فیتنە بوو بۆ خەڵکەکە، زەید کە ئەم کابرای بینی خێرا هەڵمەتی بۆ برد و کوشتی، پاشان زەید برێك قسەی کرد بۆ موسڵمانان تا دژی دوژمن بجەنگن، ئینجا وتی ئیتر یەك قسە ناکەم تا ئەوەی یان خوا دوژمن دەشکێنێت یان من دەگەمەوە بە خوا و ئەکات بەڵگەی خۆم لای خوا دەخەمەڕوو،[1] بەدەوام دەجەنگا تا شەهید کرا و ئاڵاکەی دەستی کەوت، ئەوەی زەیدی شەهید کرد کەسێك بوو بە ناوی سەلەمەی کوڕی صبیح، خێرا سالم کە مەولای ئەبی حوذەیفە بوو ئاڵاکەی هەڵگرتەوە.[2]

رایەکی تر دەڵێت ئەبوومەریەمی حەنەفی زەیدی کوشت، دواتر کە ئەبوومەریەم هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)، عومەر پێی وت زەیدت کوشت؟ ئەویش وتی خوا زەیدی بە دەستەکانی من رێزدار کرد–شەهیدبوو– منی بە دەستەکانی ئەو سەرشۆڕ نەکرد–بە بێباوەڕی بکوژرێم–.[3]

١ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ٣٢٤.

٢ - أسد الغابة، ج٢، ص ٣٤١-٣٤٢.

٣ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٣٧٨.

جا کە زەید شەهید بوو عومەری برای دەیوت زەید لە هەردوو چاکەکەدا پێش من کەوت، پێش من موسڵمان بوو، پێش منیش شەهید بوو.[١]

عومەر زۆر خەفەتی خوارد بە مەرگی براکەی، دەیوت لە هەرکوێوە با هەڵدەکات من بۆنی زەیدی برامی لێدەکەم.[٢]

عومەری کوڕی خەططاب موتەممیمی کوڕی نوەیرەی بینی، موتەممیم شیعرێکی بۆ مەرگی براکەی خۆی هۆنیبوویەوە کە مالیکی کوڕی نوەیرە بوو، عومەر دەیوت ئەگەر منیش شیعرم بزانیایە بە دڵنیاییەوە وەك تۆ شیعرم دەهۆنیەوە بەسەر زەیدی برامدا، موتەممیم وتی جا ئەگەر براکەی من وەك براکەی تۆ بڕۆیشتایە هیچ دلگران نەدەبووم بۆی، عومەر وتی کەس هێندەی تۆ جوان دڵنەوایی نەکردوم.[٣]

١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٦٠٤.

٢ - أسد الغابة، ج٢، ص ٣٤١.

٣ - أسد الغابة، ج٢، ص ٣٤٢.

## بیستەم: ماڵئاوایی زەینەبی کچی جەحش (رضي الله عنها)

زەینەبی کچی جەحش لە ئەسەدیەکانە و هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) و دایکی باوەڕدارانە.

زەینەب زۆر زوو موسڵمان بوو و یەکێکیشە لە کۆچەران، هاوسەری زەیدی کوڕی حارثە بوو، بەڵام دواتر زەید تەڵاقی دا و پێغەمبەر (ﷺ) ئەوی بەهاوسەر گرتەوە.[١]

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: (ئەوەتان خێراتر دێت بۆ لام کە دەستی درێژترە)، ئینجا ئێمەش هەموو دەکەوتینە پێوانەی دەستی یەکدی تا بزانین دەستی کاممان درێژترە، دواجار زانیمان دەستی زەینەب درێژترە چونکە ئەو بە دەستی خۆی کاری دەکرد و خێری زۆری پێ دەکرد.[٢]

دوای وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) جارێك عومەری کوڕی خەططاب مووچەکەی زەینەبی نارد بۆی، ئەویش وتی خوا لە عومەر خۆش بێت، کەسی تر هەیە لە من شیاوترە بەم هەمووە، پێیان وت ئەوە هەمووی بۆ تۆیە، وتی سوبحانەڵا، ئینجا بە پارچە قوماشێك دایپۆشی و وتی دایپۆشن و جلێکی پێدا بدەن، ئینجا

---

١ - أسد الغابة، ج٧، ص ١٣٨.

٢ - صحيح مسلم، الرقم ٤٥٩٤، صحيح ابن حبان، الرقم ٣٣٧٣.

کەوتە دابەشکردنی بەسەر خزمانی خۆی و هەتیواندا، دواتر دەستەکانی بەرز کردەوەو وتی خوایە دوای ئەمساڵ جارێکی تر مووچەی عومەرم بۆ نەیەت.[١]

زەینەب کە نەخۆش کەوت و سەرەمەرگی هات، بەوانەی دەوروبەری وت من کفنی خۆمم ئامادە کردووە، جا ئەگەر عومەر کفنی بۆ ناردم یەکێکیان بکەن بەخێر، یان ئەوەی خۆم یان ئەوەی عومەر.[٢]

زەینەب لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططاب و لە ساڵی بیستی کۆچیدا وەفاتی کرد،[٣] بەوەش یەکەم هاوسەری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو دوای وەفاتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کۆچی دوایی کرد.[٤]

کاتێك زەینەب وەفاتی کرد، عومەر فەرمانی کرد کەسێك هاوار بکات تەنها کەسە مەحرەمەکانی بچن بۆ لای تەرمەکەی، ئینجا کچەکەی عومەیس وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران بۆ شتێکت پێ نەڵێم کە ئەزموونی خەڵکی حەبەشە بوو لەگەڵ ژنەکانیان، ئینجا تابووتێکی ئامادە کرد و بە جلێك داپۆشی، عومەریش وتی شتێکی زۆر باشە، عومەر فەرمانی کرد بە کەسێك هاواری کرد لەگەڵ تەرمی دایکتان بچنە دەرەوە.[٥]

---

١ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢١٢.

٢ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢١٧.

٣ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢١٢.

٤ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ٢٠١.

٥ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢١٣.

دواتر عومەری کوڕی خەتتاب نوێژی لەسەر تەرمەکەی کرد، ئینجا برا بۆ گۆڕستانی بەقیع و لەوێ ئەسپەردە کرا.[١]

## بیست و یەکەم: مالئاوایی زوبەیری کوڕی عەووام (رضي الله عنه)

زوبەیری کوڕی عەووام کونیەکەی ئەبووعەبدوڵایەو بە حەواری پێغەمبەر (ﷺ) ناسراوە، پوورزای پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، یەکێکە لەو هاوەڵانەی شایەتی بەهەشتی بۆ دراوە.

زوبەیر لە دوای ئەبووبەکر موسڵمان بوو و چوارەم یان پێنجەم کەس بوو موسڵمان بوو.[٢]

زوبەیر لەپێناو ئیسلامدا نارەحەتی زۆری چەشت، مامی زوبەیر کە زانی زوبەیر موسڵمان بووە کەوتە ئازاردانی، لەسەر حەسیرێك رایدەکێشا و دواتر دووکەڵی بەسەردا دەکرد، هەر ئازاو ئەشکەنجەیەکی دەدا تا زوبەیر وازبهێنێت لە ئیسلام، ئەویش دەیوت هەرگیز بێباوەڕ نابم.[٣]

١ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ١٤٩.

٢ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٠١.

٣ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٥٥٥.

عائیشەی دایکی باوەڕداران کە بە عوروەی خوشکەزای وت خوشکەزاکەم هەردوو باوکت زوبەیرو ئەبووبەکر لەوانەن کە خوا باسی کردون (ٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلۡقَرۡحُۚ لِلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ مِنۡهُمۡ وَٱتَّقَوۡاْ أَجۡرٌ عَظِيمٌ)،[١] کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) تووشی ئەو بارە سەختەی ئوحود بوو و بێباوەڕان لە دەوری بڵاوەیان کرد، پێغەمبەر (ﷺ) ترسی هەبوو هەمدی بگەڕێنەوە، بۆیە فەرمووی: (کێ دەکەوێتە دوایان؟) حەفتا کەس کەوتنە دوایان، لەنێویاندا ئەبووبەکر و زوبەیریش هەبوون.[٢]

عومەری کوڕی خەططاب دەڵێت: جارێك بینیم پێغەمبەری خوا (ﷺ) خەوتبوو و زوبەیریش لە کەناریەوە دانیشتبوو و باوەشێنی دەکرد و مێشوولەی لێ دووردەخستەوە، هەتا پێغەمبەر (ﷺ) لە خەو هەستا زوبەیر هەر وایکرد، کە پێغەمبەر (ﷺ) هەستا فەرمووی: (تا ئێستاش هەر بەردەوامیت ئەی ئەبوو عەبدولا؟) ئەویش وتی بەڵێ بەدایك و باوکمەوە بەقوربانت بم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەوە جیبریلە سەلامت لێدەکات و دەفەرمویت: : من لە رۆژی دواییدا لەگەڵت دەبم و گڕی دۆزەخ لە دەموچاوت دوور دەگرم).[٣]

---

١ - آل عمران: ١٧٢.

٢ - صحيح البخاري، الرقم ٣٨٦٧،

٣ - المطالب العالية لابن حجر، الرقم ٤٠٧٤.

جارێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەسەر کێوی حیرا ء وەستابوو، کێوەکە لەریەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ئارام بگرە حیرا ء چونکە ئەوەی بەسەرتەوەیە یان پێغەمبەرە یان صدیقە یان شەهیدە)، ئەو دەمەش هەریەك لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەبووبەکر و عومەر و عوثمان و عەلی و طەلحەو زوبەیر و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص لەسەر کێوەکە بوون.[١]

کاتێك عوثمانی کوڕی عەففان کوژرا، هەریەك لە زوبەیر و طەلحەش داوای مۆڵەتیان کرد تا بچن بۆ مەککەو عەلیش مۆڵەتی پێدان و ئەوانیش چوون بۆ مەککە، خەڵکێکی زۆریش شوێنیان کەوت، لە بەصرەو مەدینەو یەمەن و چەند شوێنی ترەوە خەڵکێکی زۆر روویکردە مەککەو لەوێ ژمارەیەکی زۆری هاوەڵان و دایکانی باوەڕداران و جەماوەرێك کۆبوونەوەو داوای خوێنی عوثمانیان دەکرد، عائیشەی دایکی باوەڕدارانیش جڵەوی مەسەلەکەی گرتبوویەدەست،[٢] لەوێوە چوون بەرەو بەصرە و بە سوپایەکەوە خۆیان ئامادە کرد بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی ئیمامی عوسمان.

عەلی کوڕی ئەبووتالیب هات و لەگەڵیان رێککەوت و وتارێکی پێشکەش کرد، کاتێك لە وتارەکەی عەلیەوە دەستەی ئاژاوەگێڕان زانییان خەریکە رێکدەکەون، کەوتنە خۆ، لەوانە ئەشتەری نەخەعی و عەبدوڵای کوڕی سەبە ءو شریح و سالم و چەندێکی تر کە هیچ هاوەڵێکیان تێدا نەبوو نزیکەی دوو هەزار و

١ - صحيح مسلم، الرقم ٤٥٤٣.

٢ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٠ – ٢٣١.

پێنج سەد کەسێك دەبوون کەوتنەخۆ و وتیان ئەم ڕێککەوتنە دژ بە ئێمەیەو ژمارەشمان کەمە و ڕێککەوتنی ئەوان تەنها لەسەر خوێنی ئێمەیە، بۆیە دەبێت عەلیش وەك عوثمان لێبکەین، خەڵکەکەش ڕازی بوون، بەڵام عەبدوڵای کوڕی سەبە ءوتی ڕاکەتان زۆر خراپە، چونکە ئەوکات هەردوولا دەبنە دوژمن و لێتان دەدەن، بەڵکو دەبێت جەنگ لەنێوان ئەم دوو دەستەیەدا هەڵگیرسێنین، کاتێك زوبەیر و طەلحە چوون بۆ لای عەلی تا ڕێکبکەون، دەستەی سەبەئیەکان خۆیان بەشکرد بەسەر هەردوولادا و جەنگیان هەڵگیرساند، هەردوولا وایانزانی بەرامبەر ناپاکی نواندووە، بۆیە کەوتنە هێرش، سوپای عەلی نزیکەی بیست هەزار کەس و سوپای عائیشەش نزیکەی سی هەزار کەس دەبوون، جەنگێکی قورس ڕوویدا، عەلی هاواری دەکرد دەست هەڵگرن، بەڵام کەس نەیدەبیست، لەولاشەوە عائیشە بە سواری وشترێکەوە بۆ هەمان نیاز هات، عەلی هێندە بێزار بوو بە حەسەنی کوڕی دەوت کوڕم خۆزگە باوکت بیست ساڵ لەمەوبەر دەمرد، عەلی چو تا زوبەیر و طەلحە بدوێنێت، وتی ئەم سوپایەتان ئامادە کردووە، بیانووشتان بۆ قیامەتتان ئامادە کردووە؟ دەی لەخوا بترسن، من خوێنی ئێوەم حەڵاڵ نەکردووە، ئێوە هیچ بەڵگەیەکتان پێیە بۆ ڕەوایی خوێنی من؟[١]

عەلی بە زوبەیری وت سوێندت دەدەم بە خوا تۆ گوێت لە پێغەمبەر (ﷺ) نەبوو کە پێی دەفەرموویت تۆ لەگەڵ عەلی دەجەنگێیت و تۆیش ستەمی

١ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٨ — ٢٤١.

لێدەکەیت؟ ئەویش وتی بەڵێ، بەڵام ئەوە ئێستا ئەو فەرموودەیەم بیردەکەوێتەوە، بۆیە کەناری گرت.[١]

ئینجا بە سوارەکەیەوە بە ناو ریزەکاندا دەگەڕایەوە، عەبدوڵای کوڕی وتی باوکە چیتە؟ زوبەیر وتی عەلی فەرموودەیەکی بۆ باسکردم کە من خۆم لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیستبوو پێی فەرمووم (تۆ لەگەڵ عەلی دەجەنگیت و ستەمیشی لێ دەکەیت)، بۆیە لەگەڵی ناجەنگم، عەبدوڵا وتی بۆچی بۆ جەنگ هاتبوویت؟ تۆ هاتبوویت تا نێوانی خەڵکەکە رێکبخەیت و خوا بە هۆی تۆوە ئەم بارە رێکبخات، زوبەیر وتی سوێندم خواردووە جەنگ نەکەم، عەبدوڵا وتی دەی جیرجیسی کۆیلەت ئازاد بکەو بوەستە تا نێوانی خەڵك رێکبخەت، ئەویش کۆیلەکەی ئازاد کرد و راوەستا، بەڵام خەڵکەکە جیاوازی زیاتری تێکەوت، بۆیە بە ئەسپەکەیەوە چوو.[٢]

زوبەیر کە چوو دای بە لای سەربازگەکەی ئەحنەفدا، ئەویش وتی کێ دەچێت هەواڵێکی ئەمەم بۆ وەربگرێت، ئیبن جرمووز وتی من، ئەوەبوو کەوتە شوێن زوبەیر، کە گەیشت بە زوبەیر، زوبەیر زۆر تووڕە بوو، وتی چیتە؟ ئیشت چیە؟ وتی هاتوم تا پرسیارێکت لێ بکەم، عەطیە کە خزمەتکارێکی زوبەیر بوو و لەگەڵ زوبەیر بوو وتی ئەو چەکی پێیە، بەڵام زوبەیر گوێی پێ نەدا، ئیبن

١ - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٥٥٥٣.

٢ - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٥٥٥٢، حسنه الألباني بل صححه للوجه الثاني للسند في سلسلة الاحاديث الصحيحة، الرقم ٢٦٥٩.

جرمووز وتی کاتی نوێژە، ئەوەبوو دابەزین تا نوێژ بکەن، کەچی ئیبن جرمووز خۆی خستە پشتی زوبەیر و لە پشتەوە کەلەبەری زرێپۆشەکەی کردە ئامانج و دای لە زوبەیر و کوشتی و ئەسپ و چەکەکەشی برد، دواتریش وازی لە خزمەتکارەکەی هێنا، خزمەتکارەکەشی تەرمی زوبەیری ئەسپەردە کرد و دواتر چوو هەواڵەکەی بردەوە بۆ خەڵکەکە.[١]

لە سەرەتای جەنگەکەوە زوبەیر عەبدوڵای کوڕی بانگ کرد و وتی کوڕی شیرینم ئەمڕۆ هەرکەس دەکوژرێت یان وەك ستەمکار دەکوژرێت یان وەك ستەملێکراو، وادەزانم ئەمڕۆ من وەك ستەملێکراو دەکوژرێم، گەورەترین خەفەتیشم قەرزەکانمە، چیم هەیە بیفرۆشەو قەرزەکانم بدەرەوە، ئەگەر شتێکی مایەوە ئەوە سێ یەکی بۆ منداڵەکانت، کوڕی شیرینم ئەگەر لە دانەوەی قەرزەکاندا گیرۆدە بوویت ئەوا پەنا ببە بۆ لای مەولاکەم، عەبدوڵا وتی باوکە گیان مەولاکەت کێیە؟ وتی خودا.[٢]

ئیبن عەبباس دەڵێت: لە جەنگی جەمەلدا بە زوبەیرم وت ئەرێ هاتویت لەگەڵ کوڕی عەبدولموطەلیبدا بجەنگیت؟ ئیتر زوبەیر گەڕایەوە، کەچی ئیبن جرمووز خۆی گەیاند پێی و کوشتی، دواتر ئیبن عەبباس هات و پرسیاری کرد لە عەلی ئەرێ بکوژەکەی زوبەیر سەرەنجامی بەرەو کوێیە؟ عەلی وتی دۆزەخ.

١ - تاريخ الطبري، ج٣، ص ٥٥.

٢ - المنتظم لابن الجوزي، ج٥، ص ١٠٩.

کوژرانی زوبەیری کوڕی عەووام لە جومادیلئوولای ساڵی سی و شەش بوو، ئەو کەسەش کە کوشتی ناوی عەمری کوڕی جرمووز بوو و لە شوێنێك بە ناوی وادی سباع بە ناپاکی کوشتی، هاوکات هەریەك لە فوضالەی کوڕی حابس و نوفەیع هاوکاری عەمریان کرد لە کوشتنی زوبەیردا.[١]

کاتێك بارەکە هێور بوویەوە، ئینجا عەبدوڵا دەستی کرد بە دانەوەی قەرزەکانی باوکی، زوبەیر دەڵێت حسابم کرد قەرزەکانی نزیکەی ملیۆنێك و دووسەد هەزار دەبوو، گەیشتم بە حەکیمی کوڕی حیزام، وتی برازاکەم قەرزەکەی براکەم چەندە؟ منیش حەزم نەکرد بیڵێم چەندە، وتم دووسەد هەزار، وتی دەی بڕوا ناکەم ئەوەی هەتانە بەشی دانەوەی بکات، منیش وتم ئەی ئەگەر ملیۆنێ و دووسەد هەزار بێت چی؟ وتی وا نابینم بتوانن بیدەنەوە، ئەگەر پەکت کەوت پێم بڵێ یارمەتیت دەدەم، عەبدوڵا باخەکەی زوبەیری فرۆشت بە ملیۆنێك و شەش سەد هەزار، دەیوت کێ قەرزی لای زوبەیر بووە با بێت باخەکەمان لێ بکڕێت، عەبدوڵای کوڕی جەعفەر هات کە چوارسەد هەزاری لای زوبەیر بوو، وتی حەز دەکەن مەمدەنەوە، حەزیش دەکەن دوای خەن، عەبدوڵا وتی نا، ئەویش وتی دەی پارچەیەکی باخەکەم بدەنێ، بەوجۆرە باخەکەی بەش بەش فرۆشت و هەموو قەرزەکەی دایەوەو زیاد لە چوارسەد هەزاریشی بۆ مایەوە.[٢]

---

١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٥٥٧.

٢ - المنتظم لابن الجوزي، ج٥، ص ١١٠.

## بیست و دووەم: ماڵئاوایی سەعدی کوڕی موعاذ (رضي الله عنه)

سەعدی کوڕی موعاذی کوڕی نوعمان، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان و گەورەی ئەوسیەکانە، کونیەکەی ئەبووعەمرە.[1]

سەعدی کوڕی موعاذ یەکێکە لە بەشداربوانی غەزای بەدر، لەو غەزایەدا ئاڵای ئەوسیەکان بەدەست ئەوەوە بوو.[2]

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) دەرچوو بۆ بەدر، پێش غەزاکە رای خەڵکی وەرگرت و فەرمووی راتان چیە؟ ئەبووبەکری صدیق وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بیستوومانە ئەوان–قورەیش– لە فلانە شوێنن، هەمدی پێغەمبەر (ﷺ) بە خەڵکەکەی فەرموو راتان چیە؟ ئەمجار عومەری کوڕی خەططاب هەمان قسەی ئەبووبەکری کرد، هەمدی پێغەمبەر (ﷺ)رای هاوەڵانی وەردەگرت و فەرمووی راتان چیە؟ ئینجا سەعدی کوڕی موعاذ قسەی کرد و وتی: (مەبەستت ئێمەیە، سوێند بەوەی رێزداری کردویت و قورئانی بۆ دابەزاندویت، من رێی وام هەرگیز نەگرتوەتەبەر و شارەزاییم لێی نیە، بەڵام ئەگەر برۆی تا بیرکولغیماد لە یەمەن هاودەم بە تۆ دێین، ئێمە وەك ئەو بەنوئیسرائیلیانە نین کە بە مووسایان وت (اذهب أنت و ربك فقاتلا إنا هاهنا قاعدون) (خۆت و خواکەت برۆن بجەنگن، ئێمە لێرە دانیشتوین)، بەڵکو دەڵێین برۆ خۆت و پەروەردگارت بجەنگن و

---

١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٣، ص ٨٤.

٢ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٢١.

ئێمەش لەگەڵتاندا شوێنت دەکەوین، لەوانەیە تۆ بۆ شتێك دەرچووبیت و خواش شتێکی تری هێنابێتە ڕێت، بزانە ئەوەی خوا بۆی داناویت کامەیە ئەوە بگرەبەر، چ پەتێکت دەوێت بیگەیەنەو چ پەتێکت دەوێت بیپچڕێنە،[1] لەگەڵ کێ دەتەوێت ئاشتی بکەو دژایەتی کێت دەوێت بیکە، چەندەت دەوێت لە سامانمان بیبە)، لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە سەعد وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوێند بەخوا ئەگەر فەرمان بکەیت تاو بدەینە ناو ئەو دەریایە ئەوە لەگەڵت دێین، دەی لێنەوە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ).[2]

دوای غەزای خەندەق پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەعدی کوڕی موعاذی هاودەم بە سەعدی کوڕی عوبادە نارد تا هەواڵی جوولەکەکانی بەنی قورەیظەی بۆ وەربگرن، ئەوانیش هەواڵیان هێنایەوە کە ناپاکییان نواندووە.[3]

لەو غەزایەدا لەکاتی هێرش بۆ سەر جوولەکەکان تیرێکی بەرکەوت و پاش ماوەیەك بەو هۆیەوە مرد.[4]

عائیشەی دایکی باوەڕداران لەگەڵ دایکی سەعددا پێکەوە بوون، سەعد درعێکی پۆشیبوو کە هەموو باڵی دەرکەوتبوو، دەچوو بەرەو جەنگەکە، دایکیشی دەیوت رۆڵە گیان خێرا کە دوا کەوتیت، ئەوەبوو کابرایەك بە ناوی

---

[1] - مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ٣٥٩٧٨.

٢ - تاريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص ٥٢.

٣ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ١٠٣-١٠٤.

٤ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٢٨١.

ئیبنولعرقە تیرێکی بۆ هاویشت و وتی بیگرە من ئیبنولعرقەم، سەعد وتی خوا لە دۆزەخدا عارەقەی نێو چاوانت بێنێ ئەگەر من لەم جەنگەی قوڕەیش رزگارم بێت دەبێت بنەومە ئێوە، خوایە ئاواتمە دژ بە دەستەیەك بجەنگم کە ئازاری پێغەمبەرەکەی تۆیان داوەو بە درۆیان خستووەتەوە، خوایە ئەگەر جەنگ کەوتە نێوانمانەوە شەهیدیم پێ ببەخشەو مەشممرێنە تا تاسەم بۆ بەنی قورەیضەش دەشکێت.[١]

ئەو تیرەی بەر سەعد کەوت بەر دەمارێکی باڵی کەوت، پێغەمبەر (ﷺ) خۆی بە سەرەتیرێك دەمارەکەی بۆ داخکرد، بەڵام هەمدی خوێنی لێ چوو، پێغەمبەر (ﷺ) جارێکی تر داخکردنی دەماری بۆ بەکارهێنا،[٢] سەعد وتی خوایە گیانم دەرمەکە تا دەروونم بە بەنو قورەیضەش ئارام دەگرێت، ئەوەبوو خوێنەکەی وەستا تا ئەوەی جوولەکەکان رازی بوون بە بڕیاری سەعد و ئەویش بڕیاری خۆی دا لەسەریان، دوای ئەوە جارێکی دی دەماری خوێنی تووشی خوێن بەربوون بوو تا بەو هۆیەوە مرد.[٣]

١ - تأريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص ٢٩٢.

٢ - صحيح مسلم، الرقم ٤١٨٤.

٣ - صحيح ابن حبان، الرقم ٤٨٥٧، سنن الترمذي، الرقم ١٥٩، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٤٤٨٥، صححه شعيب الارناؤوط، صححه الالباني في صحيح و ضعيف سنن الترمذي، الرقم ١٥٨٢، صحه الذهبي في تاريخ الإسلام ج٢، ص ٣١٩.

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆ لای سەعد، باوەشی پێدا کرد و خوێن بەسەر پێغەمبەردا (ﷺ) دەچۆڕا، کە ئەبووبەکر هات و ئەوەی بینی وتی وەی پشتی شکاوم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی وس ئەی ئەبووبەکر، ئینجا عومەر هات کە ئەو حاڵەی بینی وتی إنا لله و إنا إليه راجعون.[١]

کە جەنگەکە تەواو بوو، پێغەمبەر (ﷺ) بە موسڵمانانی راگەیاند خوا فەمانی کردووە هێرش بکەنە سەر بەنی قورەیضە، گەمارۆی دان، ماوەیەکی زۆر مانەوە تا دواجار رازی بوون سەعدی کوڕی موعاذ حوکمیان لەسەر بدات، چونکە ئەوان پێشتر لەگەڵ سەعد و ئەوسیەکاندا هاوپەیمانییان هەبوو.[٢]

پێغەمبەر (ﷺ) ناردی بە شوێن سەعددا، سواری گوێدرێژێك کرا و هات، کاتێك لە مزگەوت نزیك بوویەوە، پێغەمبەر (ﷺ) بە پشتیوانانی فەرموو (لەبەر گەورەکەتان-یان لەبەر چاکترینتان- هەستن)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ئەوانە-جوولەکەکان- رازی بون بە حوکمی تۆ)، ئەویش وتی بڕیارو حوکمی من ئەوەیە جەنگاوەرەکانیان بکوژرێن و ژن و منداڵیشیان بە سەبی بگیرێن، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (بە حوکمی خوا حوکمت دا).[٣]

---

١ - فضائل الصحابة لأحمد بن حنبل، الرقم ١٤٤٩.

٢ - تاريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص ٣٠٩.

٣ - صحيح البخاري، الرقم ٣٩١١، صحيح مسلم، الرقم ٣٤٠١، صحيح ابن حبان، الرقم ٧١٣٦، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٧٩٤٩، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٦٧٥١، مسند احمد بن حنبل، الرقم ١١٤٥٤، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم ١١٥٣، المعجم الكبي للطبراني، الرقم ٥١٨٢.

کاتێك سەعد دەهات بەرەو لای پێغەمبەر (ﷺ) کابرایەك لەگەڵی بوو باسی فەزڵ و چاکەی بەنی قورەیضەی بۆ دەکرد، دەیوت ئەوان تەنها تۆیان هەڵبژاردووە بەو هیوای رەحمێکت هەبێت بەرامبەریان، بەردەوام ئەو قسانەی بۆ دەکرد، سەعدیش هیچ قسەی لەگەڵ نەدەکرد و وەڵامی نەدەدایەوە تا نزیك بوونەوە، کابرا وتی ئەرێ وەڵامم نادەیتەوە؟ سەعد وتی ئێستا کاتی ئەوەیە لەبەر خوا گوێ بە سەرکۆنەی سەرکۆنەکاران نەدەم، کابرا بێهیوا بوو و جێیهێشت.[١]

پێش ئەوەی سەعد حوکم بدات پێیان وت ئەی ئەبووعەمر پێغەمبەری خوا (ﷺ) تۆ راسپاردووە تا حوکم بدەیت لەسەریان، ئەویش وتی بەڵێنی خوا دەدەن کە بە حوکمەکەم رازی بن؟ وتیان بەڵێ، ئینجا وتی ئەمانەی ئەم لاش (ئەو لایەی کە پێغەمبەری خوای (ﷺ) تێدا بوو) بەڵام لە شەرمی پێغەمبەر (ﷺ) رووی نەکردە لاکەی پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی بەڵێ،[٢] سەعد وتی حوکمی من ئەوەیە جەنگاوەرەکانیان بکوژرێن و ژن و منداڵیان بە سەبی بگیرێن.[٣]

کاتێك سەعد وەفاتی کرد، دایکی دەستی کرد بە گریان و قیژە، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو:(ئەرێ ئیتر بۆچی فرمێسکت ناوەستێنیت و خەفەتت

---

١ - تاريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص ٣١٥.

٢ - تاريخ الإسلام، ج٢، ص ٣١٤.

٣ - صحيح البخاري، الرقم ٢٨٩٩ و ٣٦١٦، صحيح مسلم، الرقم ٣٤٠١.

لانابەیت، خۆ کوڕەکەت یەکەم کەسە خوا بۆی پێکەنی و عەرشی خوا بۆی لەریەوە).[١]

پێغەمبەر (ﷺ) چوویە ناو گۆڕەکەی سەعد و ماوەیەك مایەوەو دواتر هاتە دەرەوە، وتیان ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆچی وا مایتەوە تیایدا؟ فەرمووی (سەعد لە گۆڕدا گوشرانێك گوشرا، منیش داوام لە خوا کرد ئەوەی لەسەر لابرد- یان لا ببات).[٢]

پێغەمبەری خوا (ﷺ) پاش مەرگی سەعدی کوڕی موعاذ فەرمووی (اهتز عرش الرحمان لموت سعد بن معاذ)،[٣] (عەرشی پەروەردگار بۆ مەرگی سەعدی کوڕی موعاذ لەرزی).

سەعد داوای کردبوو لە خوای گەورە تای لەگەڵ بێت بۆ ئەوەی پاداشتی بۆ بنووسرێت، ئەوەبوو تا مرد تای لەگەڵ بوو.[٤]

---

١ - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٨٧٧، صححه الذهبي في التلخيص.

٢ - صحيح ابن حبان، الرقم ٧١٤٤، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٨٧٦، ضعفه شعيب الأرناؤوط، صححه الذهبي في التلخيص.

٣ - صحيح البخاري، الرقم ٣٦١٥، صحيح مسلم، الرقم ٤٦١٦، صحيح ابن حبان، الرقم ٧١٤١، سنن ابن ماجة، الرقم ١٥٦، سنن الترمذي، الرقم ٣٨٦٥، مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ٣١٦٧٢، مسند احمد بن حنبل، الرقم ١٤١١٥، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم ١٨٨٦، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٥١٩٦.

٤ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٢١.

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت جارێك جبەیەکی چاك و ناوازە بە دیاری هێنرا بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، خەڵکی زۆر پێی سەرسام بوون، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (والذي نفس محمد بیده، لمنادیل سعد بن معاذ في الجنة أحسن من هذا)،[1] (سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە دەستەسڕەکەی سەعدی کوڕی موعاذ لە بەهەشتدا زۆ لەوە باشترە).

مەسەلەی رووداوی بەنوقورەیضە مشتومڕێکی زۆری لەسەرەو هەندێ بە ئەفسانەی دەزانن‌و هەندێکیش زێدەڕۆیی دەکەن لە وردەکاریەکانیدا، ئەو رووداوە حەقیقەتێکی مێژوویی هەیە، بەڵام نەك بەو جۆرەی لە سەرچاوەکانی مێژوودا باس کراوە، چونکە هەم لە کوشتاری کەسەکان‌و ژمارەی کوژراوەکانیشدا زێدەڕۆیی هەیە، ئەوەی دەقی صەحیحەو لە بوخاری‌و موسلیمدا هاتووە، بڕیار دراوە تەنها جەنگاوەرەکانیان بکوژرێن، ئەمەش نابێت بە چاوی جموجووڵێکی رۆژانە تەماشا بکرێت، بەڵکو باسوخواسەکە تایبەتە بە مەیدانی جەنگ‌و ئاسایشی نیشتیمانیەوە.

---

١ - صحیح البخاري، الرقم ٢٤٩٤، صحیح مسلم، الرقم ٤٦١٩، صحیح ابن حبان، الرقم ٧١٤٨، سنن الترمذي، الرقم ١٦٩٠، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٩٢٩٤، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ٥٧٠١، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٢٨٩٤، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم ٣٠٢٩، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٥٢٠٦.

## بیست و سێهەم: ماڵئاوایی طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا (رضي الله عنه)

طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا لە کۆچەرانە و یەکێکە لەو هەشت کەسەی کە یەکەمین موسڵمان بوان بوون، یەکێکیشە لە دە موژدەپێدراوی بەهەشت.[١]

طەلحە کەسێك بوو مووی زۆر بوو و دەموچاوێکی جوانی هەبوو، رەنگی سپی و سوور بوو، رۆیشتنی خێرا بوو.[٢]

کاتێك ئەبووبەکر موسڵمان بوو خێرا چوو بۆ لای عوثمانی کوڕی عەففان و طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا و زوبەیری کوڕی عەووام و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و باسی ئیسلامی کرد بۆیان و بانگهێشتی کردن بۆ ئیسلام، هەموو ئەوانەش موسڵمان بوون.[٣]

طەلحە لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد و رۆڵێکی کارای بینی، کاتێك خەڵکی لە دەوری پێغەمبەر (ﷺ) بڵاوەیان کرد، تەنها دوانزە کەس لە دەوری مانەوە، یەکێك لەوانە طەلحە بوو، جا بێباوەڕان دەیانویست خۆیان بگەیەنن بە پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی کێ بەرامبەریان دەوەستێت؟ طەلحە وتی من، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی وەك هەیت (لە شوێنی خۆت بە)، یەکێك لە پشتیوانان وتی من ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، فەرمووی دەی تۆ

---

١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٣، ص ٥٢٩.

٢ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٢٤-٢٥.

٣ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص ٣٠.

بجەنگە، کابرا جەنگا تا شەهید بوو، دواتر تەماشای کرد هێشتا بێباوەڕان دێن، فەرمووی کێ ڕێیان پێ دەگرێت؟ طەلحە وتی من، پێغەمبەر (ﷺ) هەمان شتی پێ فەرموو و ئەمجارەش کابرایەکی پشتیوانی چوو تا ئەویش شەهید بوو، بەردەوام بەو جۆرە بوو تا هەموو پشتیوانیەکانی دەوری شەهید بوون و تەنها مایەوە پێغەمبەر (ﷺ) و طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی کێ ڕێیان پێ دەگرێت؟ طەلحە وتی من، جەنگی یانزە کەسی کرد تا شمشێر بەر دەستی کەوت و پەنجەکانی بڕا، طەلحە وتی ئاخ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەگەر بتوتایە بەناوی خوا فریشتەکان بەرزیان دەکردیتەوەو خەڵکیش تەماشایان دەکرد، دواتر خوای گەورە بێباوەڕانی تێکشکاند.[١]

هەروەها لە غەزای خەندەق و سەرجەم غەزاکانی دواتریشدا بەشداری کرد.[٢]

پێغەمبەر (ﷺ) زۆر ڕێزی لە توانا و چاکی طەلحە دەنا، ئەوەبوو هەرجارەو نازناوێکی لێدەنا، لە غەزای ئوحودا ناوی نا طەلحەی خێر، لە غەزای ذیلعوشەیرەدا ناوی نا طەلحەی فەییاض، لە غەزای خەیبەریشدا ناوی نا طەلحەی جوود–سەخاوەت–.[٣]

---

١ - السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٤٢٢٦، المعجم الاوسط للطبراني، الرقم ٨٨٧٢، حسنه الألباني في صحيح و ضعيف سنن النسائي، الرقم ٣١٤٩.

٢ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٢١٧.

٣ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٣٠، قال الذهبي إسناده لين.

جارێك پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (هەركەس حەز دەكات سەیری شەهیدێك بكات كە بەسەر زەویدا دەچێت بە رێدا، ئەوە با تەماشای طەلحەی كوڕی عوبەیدوڵا بكات).[1]

كاتێك عوثمانی كوڕی عەففان كوژرا، هەریەك لە زوبەیر و طەلحەش داوای مۆڵەتیان كرد تا بچن بۆ مەككەو عەلیش مۆڵەتی پێدان و ئەوانیش چوون بۆ مەككە، خەڵكێكی زۆریش شوێنیان كەوت، لە بەصرەو مەدینەو یەمەن و چەند شوێنی ترەوە خەڵكێكی زۆر روویكردە مەككەو لەوێ ژمارەیەكی زۆری هاوەڵان و دایكانی باوەڕداران و جەماوەرێك كۆبوونەوەو داوای خوێنی عوثمانیان دەكرد،[2] لەوێوە چوونە بەصرەو بە سوپایەكەوە خۆیان كۆكردبوویەوە هەتا داوای خوێنی ئیمامی عوسمان بكەن.

عەلی كوڕی ئەبووتالیب هات و لەگەڵیان رێككەوت و وتارێكی پێشكەش كرد، كاتێك لە وتارەكەی عەلیەوە دەستەی ئاژاوەگێڕان زانییان خەریكە رێكدەكەون، كەوتنە خۆ، لەوانە ئەشتەری نەخەعی و عەبدوڵای كوڕی سەبە ء و شریح و سالم و چەندێكی تر كە هیچ هاوەڵێكیان تێدا نەبوو نزیكەی دوو هەزار و پێنج سەد كەسێك دەبوون كەوتنەخۆ و وتیان ئەم رێككەوتنە دژ بە ئێمەیەو ژمارەشمان كەمە و رێككەوتنی ئەوان تەنها لەسەر خوێنی ئێمەیە، بۆیە دەبێت

---

١ - سنن الترمذي، الرقم ٣٧٥٨، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٥٥٩١، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن الترمذي، الرقم ٣٧٣٩.

٢ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٠ – ٢٣١.

عەلیش وەك عوثمان لێبکەین، خەڵکەکەش رازی بوون، بەڵام عەبدوڵای کوڕی سەبە ءوتی راکەتان زۆر خراپە، چونکە ئەوکات هەردوولا دەبنە دوژمن و لێتان دەدەن، بەڵکو دەبێت جەنگ لەنێوان ئەم دوو دەستەیەدا هەڵگیرسێنین، کاتێك زوبەیر و طەلحە چوون بۆ لای عەلی تا رێکبکەون، دەستەی سەبەئیەکان خۆیان بەشکرد بەسەر هەردوولادا و جەنگیان هەڵگیرساند، هەردوولا وایانزانی بەرامبەر ناپاکی نواندووە، بۆیە کەوتنە هێرش.[١]

که جەنگی جەمەل روویدا، عەلی کوڕی ئەبووطالیب طەلحەی دواند و هەندێ لەو قسانەی پێ وت کە بە زوبەیری وتبوو، طەلحە ش کەناری گرت لە جەنگەکەو دواتر تیرێکی بەرکەوت و کوژرا،[٢] مەڕوانی کوڕی حەکەم طەلحەی کردە چاو، چونکە ئەوی بە بکوژی عوثمانی کوڕی عەففان دەزانی و دەیوت ئەمە پشتیوانی نەیارانی عوثمان بوو، بۆیە تیرێکی تێگرت و دای لە ئەژنۆی، بەردەوام خوێنی لێدەچوو تا کوشتی،[٣] ئەمەش لە رۆژی پێنج شەممە و دەی جومادیلئوولای ساڵی سی و شەشی کۆچیدا بوو، ئەو کات تەمەنی نزیکەی شەست و چوار ساڵ دەبوو.[٤]

---

١ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٨ — ٢٤١.

٢ - أسد الغابة، ج٣، ص ٨٥.

٣ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٣، ص ٥٣٢، قال ابن حجر إسناده صحيح.

٤ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٣، ص ٥٣٢.

کاتێك عەلی تەرمەکەی طەلحەی بینی، خۆڵی سەر دەموچاوی دەتەکاند و رەحمەتی بۆ دەنارد و دەیوت خۆزگە بیستساڵ لەمەوبەر بمردمایە، خۆی و هاوەڵانی لەسەر تەرمی طەلحە دەگریان.[1]

١ - أسد الغابة، ج٣،ص ٨٦.

## بیست و چوارەم: ماڵئاوایی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (رضي الله عنه)

سەعدی کوڕی مالیك باوکی بە ئەبی وەقاص ناسراوە،[١] لە کۆچەریەکانەو زۆر زوو موسڵمان بوو،[٢] موسڵمانبوونەکەی لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا بوو.[٣]

دەوترێت سەعد سێیەم کەس بووە موسڵمان بووە، چونکە خۆی دەڵێت حەوت دانە شەوم بەسەر برد، لەو ماوەدا من سێ یەکی ئیسلام بووم.[٤]

بەڵام رای تر هەیە دەڵێت چوارەم یان شەشەم کەس بووە موسڵمان بووە،[٥] ئەم رایەش نزیکترە لە راستیەوە، چونکە بە روونی سەلماوە کە پێش ئەو چەند کەسی تر موسڵمان بون، لەوانە خەدیجە و ئەبووبەکر و زەید.[٦]

سەعد دەڵێت من پێشتر زۆر لەگەڵ دایکم چاك بووم، جا کاتێك موسڵمان بووم دایکم وتی ئەی سەعد ئەم دینە چیە هێناوتە؟ یان واز لەو دینە دێنیت یان من خواردن و خواردنەوە لە خۆم حەرام دەکەم تا دەمرم و بەو هۆیەوە لەبەر من ئابڕووت دەچێت و دەڵێن بکوژی دایکتی، منیش وتم دایە گیان ئەوە مەکە، من واز لە دینەکەم ناهێنم، ئەوەبوو رۆژێك دەستی گرتەوە لە خواردن و

---

١ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٩٣.

٢ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٣، ص ٧٣.

٣ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٩٦.

٤ - صحيح البخاري، الرقم ٣٥٤٢.

٥ - أسد الغابة، ج٢، ص ٤٣٣.

٦ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص ٣٢.

خواردنەوە، بۆ بەیانیەکەی زۆری بۆ هاتبوو، منیش کە ئەوەم بینی وتم دایە گیان بەخوا ئەگەر سەد گیانت هەبێت و یەك یەك هەموویان دەربچن واز لە دینەکەم ناهێنم، جا ئەگەر پێت خۆشە بخۆ و پێشت خۆشە مەخۆ، دایکم کە زانی وا سوورم دەستی کرد بە نان خواردن.[١]

سەعد دەڵێت لە غەزای ئوحوددا پێغەمبەر (ﷺ) کیفی تیرەکانی خۆی پێدەدادم و دەیفەرموو (بوەشێنە بە دایك و باوکمەوە بەقوربانت بم).[٢]

هەروەها سەعد لە غەزای خەندەقیشدا بەشداری کرد، لەو غەزایەدا تیری دەهاویشت، پێغەمبەر (ﷺ) بە جووڵەی سەربازیی سەعد پێکەنی تا ئەوەی دانەکانی پێشەوەی دەرکەوتن.[٣]

سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص لە فەتحی مەککەشدا بەشداری کرد و تیایدا ئاڵایەکی کۆچەرانی بەدەستەوە بوو.[٤]

لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە سەعد یەکێکە لەو دە هاوەڵەی پێغەمبەر (ﷺ) موژدەی بەهەشتی پێدان.[١]

---

١ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ١٠٩.

٢ - صحيح البخاري، الرقم ٣٨٤٧.

٣ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ١٠٣.

٤ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٤٢.

عەبدوڵای کوڕی عەمر دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (یەکەم کەس لەم دەرگاوە دێتە ژوورەوە پیاوێکە لە ئەهلی بەهەشتە)، ئەوەبوو سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص هاتەژوورەوە.[٢]

سەعد لە ساڵی پەنجاو پێنجی کۆچیدا لە کۆشکەکەی خۆی لە ناوچەی عەقیق وەفاتی کرد، ئەو ناوچەیە نزیکەی حەوت میل لە مەدینەوە دووربوو، ئینجا تەرمەکەی برا بۆ مەدینە،[٣] سەعد کۆتا هاوەڵی کۆچەران بوو کە وەفاتی کرد.[٤]

سەعد لە کاتی وەفاتیدا تەمەنی هەشتاو دوو ساڵ بوو،[٥] رایەکی تریش دەڵێت تەمەنی حەفتا و ئەوەندە ساڵ بوو.[٦]

موصعەبی کوڕی دەڵێت سەری باوکم لە کۆشم بوو کاتێك لەسەرەمەرگدا بوو، منیش دەستم کرد بە گریان، باوکم سەری بەرز کردەوەو وتی کوڕە

١ - سنن أبي داود، الرقم ٤٠٥٢، صحيح ابن حبان، الرقم ٧١٠٣، سنن الترمذي، الرقم ٣٧٦٧، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٧٩٢١، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٥٦٧، المعجم الأأوسط للطبراني، الرقم ٧٣٥٥، صححه شعيب الارناؤوط، كما صححه الألباني في صحيح و ضعيغ سنن أبي داود، الرقم ٤٦٤٩.

٢ - مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٦٨٨٦، ضعفه شعيب الأرناؤوط.

٣ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٩٧.

٤ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ١٢٣.

٥ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ١٢٤.

٦ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٤٩.

ئازیزەکەم بۆچی دەگریت؟ وتم بابە گیان بۆ حاڵ و شوێنی تۆ، وتی مەگری، چونکە خوا هەرگیز سزای من نادات، من لە ئەهلی بەهەشتم.[١]

دواتر داوای جبەیەکی خوری کرد و وتی لەمەدا کفنم بکەن، چونکە بەم جبەوە بەشداری غەزای بەدرم کردووە، لەو کاتەوە ئەم جبەم هەڵگرتووەو شاردوومەتەوە بۆ ئەم ڕۆژەم.[٢]

عائیشە داوای کرد تەرمی سەعد ببرێتە مزگەوت و لەوێ نوێژی لەسەر بکرێت، بەڵام خەڵکی رازی نەبوون، عائیشە وتی خەڵکی چەند زوو شتیان بیرچوەتەوە، خۆ پێغەمبەر (ﷺ) لە مزگەوت نوێژی کرد لەسەر سوهەیلی کوڕی بەیضاء.[٣]

کاتێك سەعد وەفاتی کرد والی مەدینە مەروانی کوڕی حەکەم بوو، بۆیە مەڕوان نوێژی مردووی لەسەر کرد.[٤]

---

١ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ١٢٢.

٢ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ١٢٢.

٣ - صحيح مسلم، الرقم ١٦٦٨.

٤ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٤٩.

## بیست و پێنجەم: ماڵئاوایی عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە (رضي الله عنه)

عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان،[١] یەکێکە لە دەستەی یەکەمی موسڵمان بوانی ناو پشتیوانان، هەروەها یەکێکە لە دوانزە نەقیبەکەی شەوی بەیعەتی عەقەبە.[٢]

عەبدوڵا لە هەریەك لە غەزاکانی بەدر و ئوحود و خەندەق و لە حودەیبیە و عومرەی پاش حودەیبیەشدا بەشداری کرد،[٣] عەبدوڵا کە دەچوو بۆ غەزا، یەکەم کەس دەکەوتەڕێ و لەوسەریشەوە کۆتا کەس بوو دەگەڕایەوە.[٤]

جارێك عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە دەچوو بۆ مزگەوت، نزیك بوویەوە لە مزگەوت و گوێی لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو کە وتاری دەدا و فەرمووی(دابنیشن)، عەبدوڵاش هەر لە دەرەوە دانیشت، دواتر پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەوەی بیستەوە، بە عەبدوڵای فەرموو (خوای گەورە سوور بونت لەسەر گوێڕایەڵی خوا و گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەی زیاد بکات).[٥]

---

١ - أسد الغابة، ج٣، ص ٢٣٧.

٢ - الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٣، ص ٨٩٨.

٣ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٢٦.

٤ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ٨٤.

٥ - دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ٢٥١١، صححه ابن حجر في الإصابة، ج٣، ص ٨٤.

ئەبوودەردا ء دەڵێت جاری وا هەبوو لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) دەردەچووین، رۆژەکە زۆر گەرم دەبوو، کەس نەبوو بەڕۆژوو بێت جگە لە پێغەمبەر (ﷺ) و عەبدوڵای کوڕی رەواحە.[١]

رۆژێك عەبدوڵای کوڕی رەواحە نەخۆش کەوت و لەهۆش خۆی چوو، پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆ سەردانی، نزای بۆ کرد و فەرموی(خوایە ئەگەر ئەجەلی هاتووە لەسەری سووك بکە، ئەگەریش ئەجەلی نەهاتووە شیفای بدە)، عەبدوڵا کەمێك هاتەوە هۆش خۆی و وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دایکم دەیوت کێوەکەم رۆ، پشتی شکاوم، فریشتەیەکیش چەکوشێکی ئاسنینی پێ بووو دەیوت تۆ وایت؟ جا ئەگەر بموتایە بەڵێ، بەوە شەت و پەتی دەکردم.[٢]

لە مانگی جەمادیلئوولادا پێغەمبەر (ﷺ) بە نامەیەکەوە حارثی کوڕی عومەیری ئەزدی نارد بۆ لای پاشای بوصرا، کەچی کە گەیشتە موئتە شورەحبیلی کوڕی عەمری غەسانی رێی پێ گرت و کوشتی، پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی لەسەر سەخت بوو، بۆیە سوپایەکی نارد کە نزیکەی سێ هەزار کەس دەبوون، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ئەمیری خەڵکەکە زەیدی کوڕی حارثەیە، ئەگەر کوژرا ئەوە جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب ئەمیرە، ئەگەر ئەویش کوژرا ئەوە عەبدوڵای کوڕی رەواحە ئەمیرە، ئەگەر ئەویش کوژرا با موسڵمانان بە رەزامەندی خۆیان لەنێو خۆیاندا کەسێك دیاری بکەن و بیکەنە ئەمیریان)،

١ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٢٣٣.

٢ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٢٣٢.

پێغەمبەر (ﷺ) ئاڵایەکی سپی دایە دەست زەیدی کوڕی حارثەو وەسیەتی کرد بۆیان تا بچنە شوێنی کوژرانەکەی حارثی کوڕی عومەیر و خەڵکی ئەوێ بانگ بکەن بۆ ئیسلام، ئەگەر موسڵمان بوون باشە، ئەگەرنا پشت بەخوا ببەستن و دژیان بجەنگن، خۆیشی بۆ بەڕێکردنیان لەگەڵیان چوو تا گەیشتە (ثنية الوداع)، ئیتر لەوێ وەستا و مالئاوایی کرد لێیان، موسڵمانانیش نزایان دەکرد بۆیان و دەیانوت خوا بتانپارێزێ و بە چاکی و دەستکەوتەوە بتانگێڕێتەوە، دوژمنیش ئەم هەواڵەی بیست و سوپای کۆکردەوەو شورەحبیل نزیکەی سەد هەزار سەربازی کۆکردەوەو دەستەی پێشڕەوی نارد.

کاتێك موسڵمانان گەیشتنە خاکی شام و هەواڵی زۆری سوپای دوژمن و هاتنی هیرەقلیشیان بە سوپایەکەوە بیست کە نزیك لەو ناوچە بوو، وتیان با نامە بنێرین بۆ پێغەمبەر (ﷺ) تا بزانین فەرمان بە چی دەکات، بەڵام عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە موسڵمانانی هاندا تا درێژە بدەن بە چوونەکەیان، ئەوەبوو درێژەیان دا بە چوونەکەیان تا گەیشتنە موئتە، دوژمنیش بە سوپایەکی گەورەوە هاتن و جەنگ لەنێوانیاندا روویدا، زەید بە ئاڵاکەوە جەنگا تا رمێکی بەرکەوت و شەهید بوو، ئینجا جەعفەری کوڕی ئەبووطالیب ئاڵاکەی گرتەدەست و لەسەر ئەسپەکەی دابەزی و دەمارێکی پێی ئەسپەکەی بڕی تا نیشانی بدات راکردن نیە، ئینجا جەنگا تا سەربازێکی رۆمی بە شمشێر لێیدا و وا لێیدا کردی بە دوو بەشەوە، یەکێك لە بەشەکانی جەستەی نزیکەی سی و ئەوەندە برینداری پێوە بوو، بە هەموو جەستەیەوە نزیکەی حەفتاو ئەوەندە

برینداری بینرا چ لە بەرکەوتنی  شمشێر یان رم بێت، ئینجا عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە ئاڵاکەی هەڵگرت و ئەویش جەنگا تا کوژرا، ئینجا موسڵمانان ئاڵاکەیان دایە دەست خالیدی کوڕی وەلید و ئەویش بە پلانێکی سەرکەوتوو توانی پاشەکشە بکات بە سوپای موسڵمانان.[١]

زەیدی کوڕی ئەرقەم کە هەتیو بوو و لای عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە بووو ئەو سەرپەرشتی دەکرد، لە غەزای موئتەدا هاودەم بە عەبدوڵا چوو و بەشداری کرد، جا لەوێ کە شەو داهات عەبدوڵا بە هێواشی شیعری دەهۆنیەوەو تیایدا ئاواتی بە شەهیدی دەخواست، زەید کە ئەو شیعرەی بیست دەستی کرد بە گریان، عەبدوڵاش بە گۆچانەکەی دەستی تێیخوڕی و وتی لاسار تۆ چ زەرەرێك دەکەیت خوا شەهیدی بە من ببەخشێت و تۆیش لەگەڵ کاروانەکە بگەڕێیتەوە.[٢]

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی کوژرانی جەعفەر و زەید و عەبدوڵای کوڕی ڕەواحەی بیست دانیشت و خەفەت دەموچاوی داگرتبوو،[٣] ئینجا دەیفەرموو (خوایە لە زەید خۆش بیت، خوایە لە زەید خۆش بیت، خوایە لە زەید خۆش بیت، خوایە لە جەعفەر خۆش بیت، لە عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە خۆش بیت).[٤]

١ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ١٢٨-١٢٩.

٢ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ٨٤-٨٥.

٣ - صحيح البخاري، الرقم ١٢٥٠، صحيح مسلم، الرقم ١٦٠٢، صحيح ابن حبان، الرقم ٣٢٠٤، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ١٩٥٣، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ٦٦٧٨، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٣٧٥٥.

٤ - مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ١١٧٦٩،

ژنەکەی عەبدوڵا کە پاش شەهیدبوونی عەبدوڵا شووی کردەوە، بە مێردەکەی تری دەوت: عەبدوڵا کە دەیویست بچێتە دەرەوە دوو رکات نوێژی دەکرد، کە دەشهاتەوەماڵەوە دوو رکات نوێژی دەکرد، هەمیشە ئاوا بوو و قەت لەبیری نەدەچوو.[١]

## بیست و شەشەم: ماڵئاوایی عەبدوڵای کوڕی مەسعوود (رضي الله عنه)

عەبدوڵای کوڕی مەسعوود یەکێکە لە دەستەی یەکەمی موسڵمان بوان.[٢] یەکێکە لە هاوەڵە ناسراوەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و لە زاناکانی ناو هاوەڵان کە فەرموودەی زۆری لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە،[٣] کەسێکی لاوازی باڵاکورت بوو، جلی سپی دەپۆشی و بۆنی خۆشی لە خۆی دەدا.[٤]

ئیبن مەسعوود یەکێك بوو لە بەشداربوانی غەزای بەدر، لە غەزای ئوحودیشدا بەشداری کرد و تیایدا رۆڵی کارای بینی، بەتایبەت کاتێك موسڵمانان لە دەوری پێغەمبەر (ﷺ) بڵاوەیان کرد، ئیبن مەسعوود یەکێك بوو

١ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٢٣٣، صححه ابن جر في الإصابة، ج٣، ص ٨٤.
٢ - سير أعلام النبلاء للذهبي، ج١، ص ٤٦١.
٣ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ٢٣٣.
٤ - سير أعلام النبلاء للذهبي، ج١، ص ٤٦٢ — ٤٦٣.

لەوانەی لە دەوری پێغەمبەر (ﷺ) مایەوە،[١] هەروەها لە غەزای خەندەق و بەیعەتی ریضوان و هەموو غەزاکانی دواتریشدا بەشداری کرد.[٢]

ئەبوو مووسای ئەشعەری دەڵێت من و براکەم لە یەمەنەوە هاتینە مەدینە، ماوەیەكماینەوە، ئیبن مەسعوود و دایکیشی هێندە سەردانی ماڵی پێغەمبەری خوایان (ﷺ) دەکرد وامانده‌زانی لە ئالوبەیتی پێغەمبەری خوان (ﷺ).[٣]

ئیبن مەسعوود لە کاتی سەفەر و دەرچوونەکانی پێغەمبەریشدا (ﷺ) هاودەمی پێغەمبەر (ﷺ) بوو و خزمەتی دەکرد، نەعلەکانی پێغەمبەری خوای(ﷺ) هەڵدەگرت و دەیخستە بنباڵی، داردەستەکەی دەدایە دەستی.[٤]

ئیبن مەسعوود هێندە شارەزا بوو لە خوێندنەوەی قورئاندا کە پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو هەرکەس حەز دەکات بە جوانی قورئان بخوێنێتەوە با بە شێوە خوێندنەوەی ئیبن ئوم عەبد–واتە ئیبن مەسعوود–بیخوێنێتەوە).[٥]

---

١ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٤٦٧.

٢ - أسد الغابة، ج٣، ص ٣٩٦.

٣ - صحيح البخاري، الرقم ٣٥٧٥، صحيح مسلم، الرقم ٤٦٠٣، سنن الترمذي، الرقم ٣٨٢٤، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٨١١٢، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٩١٤٩.

٤ - - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٤٧٠.

٥ - صحيح ابن حبان، الرقم ٧١٧٥، سنن ابن ماجة، الرقم ١٣٧، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٢٨٢٧، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٧٢، صححه أحمد شاكر، ما صححه شعيب الأرناؤوط، كما صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن ابن ماجة، الرقم ١٣٨.

عومەری کوڕی خەططاب کاتێك عەمماری کوڕی یاسری نارد تا ببێتە ئەمیری کووفە، ئیبن مەسعوودیشی وەك مامۆستا نارد بۆ خەڵکی کووفە و وتی ئەو لەخۆبوردنەم کردووە کە عەبدوڵام لای خۆم نەهێشتووەتەوەو ناردوومە بۆتان.[١]

رۆژێك ئیبن مەسعوود کابرایەکی بینی، کابرا پێی وت ئەمشەو خەوم بینی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر مینبەرێکی بەرز بوو و تۆیش لە خوارووییەوە بوویت، دەیفەرموو ئەی ئیبن مەسعوود سەرکەوە بۆ لام دوای من جەفات پەیدا کرد، ئیبن مەسعوود وتی توخوا ئەو خەوەت بینی؟ کابرا وتی ئەریّ، ئیبن مەسعوود وتی دەی دڵنیام تۆ لە مەککە دەرناچیت تا من دەمرم و تۆیش نوێژم لەسەر دەکەیت، هەروایش بوو.[٢]

پاش ماوەیەك ئیبن مەسعوود نەخۆش کەوت، عوثمانی کوڕی عەففان هات بۆ لای، وتی ئازاری چیت هەیە؟ ئەویش وتی ئازاری تاوانەکانم، وتی ئەی حەز بە چی دەکەیت؟ وتی رەحمەتی پەروەردگارم، وتی ئەی فەرمان نەکەم پزیشکێك بێت بۆ لات، وتی پزیشك دەوای کردووم، عوثمان وتی فەرمان نەکەم بەخششت بکەن؟ وتی هیچ پێویستم پێی نیە.[٣]

---

[١] - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٤٨٥-٤٨٦.

[٢] - أسد الغابة، ج٣، ص ٣٩٩.

[٣] - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٤٩٨.

دواجار ئیبن مەسعوود لە مەدینەو لە ساڵی سی و دووی کۆچیدا وەفاتی کرد، رایەکیش دەڵێت لە ساڵی سی و سێی کۆچیدا وەفاتی کرد، ذەهەبی دەڵێت لەوانەیە لە سەرەتای ساڵی سی و سێی کۆچیدا بووبێت، تەمەنیشی شەست و سێ ساڵان دەبوو.[1]

کاتێك وەفاتی کرد نوێژی لەسەر کرا، رایەك دەڵێت عوثمانی کوڕی عەففان نوێژی لەسەر کرد، رایەکیش دەڵێت عەمماری کوڕی یاسر نوێژی لەسەر کرد، رایەکیش دەڵێت زوبەیری کوڕی عەووام نوێژی لەسەر کرد، وەستان تا شەو، چونکە خۆی وەسیەتی کردبوو شەو ئەسپەردەی بکەن، ئینجا لە گۆڕستانی بەقیع ئەسپەردەیان کرد.[2]

[1] - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٤٩٩.
[2] - أسد الغابة، ج٣، ص ٤٠٠.

## بیست و حەوتەم: ماڵئاوایی عەمری کوڕی عاص (رضي الله عنه)

عەمری کوڕی عاص یەکێکە لە هاوەڵە دیارەکان و سەرکردەیەکی بەرچاوی ناو مێژووی ئیسلامی.

لە سەردەمی نەفامیدا لە ناو قورەیشدا پێگەو ناوبانگی هەبوو، بەڵام ئەو توانایەی هەیبوو بۆ دژایەتی کردنی موسڵمانان بەکاری دەهێنا تا ئەو کاتەی موسڵمان بوو.

لە جەنگی ئوحوددا لەناو سوپای بێباوەڕاندا بەشداری کرد و هاودەم بە خۆیشی ژنەکەشی برد.[١]

لە جەنگی خەندەقیشدا دووبارە عەمری کوڕی عاص لەگەڵ بێباوەڕاندا بەشداری کرد، هەرجارەو بەشێك لە سوپای بێباوەران هەنگاویان دەنا بۆ هێرش بردن، ڕۆژێك ئەبووسوفیان هێرشی دەبرد و ڕۆژێك خالیدی کوڕی وەلید و ڕۆژێك عەمری کوڕی عاص.[٢]

موسڵمانبوونیان لە دوای ڕێککەوتنی حودەیبیە عەمری موسڵمان بوو،[٣] عەمر دەڵێت کە چوومە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) و ویستم موسڵمان بم، چومە پێشەوەو وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر ئەوە بەیعەتت پێدەدەم کە

١ - البداية و النهاية لابن كثير، ج٤، ص ١١.

٢ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ٦٧.

٣ - البداية و النهاية لابن كثير، ج٤، ص ١٤٢.

تاوانی رابردووم بسڕیتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ئەی عەمر بەیعەت بدە، چونکە ئیسلام پێش خۆی دەسڕێتەوەو هیجرەتیش پێش خۆی دەسڕێتەوە)، منیش بەیعەتم پێدا و گەڕامەوە دواوە.[١]

لە خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبوتالیبدا سێ کەس لە خەواریجەکان کە بریتی بوون لە ئیبنولمولجەم و بەرکی کوڕی عەبدوڵا و عەمری کوڕی بەکر کۆبوونەوەو باسی کوشتاری هاوڕێکانیان لە نەهرەوان کرد، بۆیە بڕیاری تۆڵەیان دا و ریککەوتن لەسەر ئەوەی هەرکامیان و یەکێك لە سەرکردەکان بکوژێت، ئیبنولمولجەم وتی من عەلی دەکوژم، بەرك وتی منیش موعاویە دەکوژم، عەمریش وتی منیش عەمری کوڕی عاص دەکوژم، ئەوەبوو هەرسێیان بەڵێنیان بە یەکدی دا و شمشێرەکانیان ژەهراوی کرد و وادەی حەڤدەی رەمەزانیان دانا.[٢]

کاتێك سێ خەواریجەکە بڕیاریاندا هەریەك لە عەلی کوڕی ئەبووطالیب و موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیان و عەمری کوڕی عاص بکوژن، ئەوەی هات عەمر بکوژێت بە هەڵە خاریجەی کوڕی حوذافەی کوشت کە دادوەری میصر بوو، چونکە وایزانی عەمرە، کەچی کە دواتر گیرا و برا بۆ لای عەمر، وتی بۆ من کێم کوشتووە؟ وتیان خاریجەت کوشتووە، ئەویش وتی من نیازم بوو عەمر بکوژم، بەڵام خوا ویستی خاریجە بێت.[٣]

---

١ - البداية و النهاية لابن كثير، ج٤، ص ١٤٢.

٢ - البداية و النهاية لابن كثير، ج٧، ص ٣٢٤-٣٢٨.

٣ - أسد الغابة، ج٢، ص ١٠٣.

دواجار عەمری کوڕی عاص لە ساڵی چل و سێی کۆچیدا وەفاتی کرد،[١] رای تریش هاتووە لە ساڵی چل و حەوت یان چل و هەشت یان پەنجاو یەکی کۆچیدا وەفاتی کردووە، لە سەرەمەرگیدا دەستی کرد بە گریان، عەبدوڵای کوڕی وتی بۆچی دەگریت؟ لە ترسی مەرگ؟ عەمر وتی نابەخوا، بەڵکو لە باری دوای مەرگ دەترسم، عەبدوڵاش دڵنەوایی دەدایەوەو باسی ئەوەی بۆ دەکرد کە لە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) بووەو لە فتووحاتی شامدا بەشدار بووە، عەمریش وتی لە هەموو ئەوانە چاکترم جێهێشتووە کە ئەویش شایەتومانی (لا الە الا اللە)ە، من کاتی خۆی سەرسەختترین نەیاری پێغەمبەر (ﷺ) بووم، جا ئەگەر ئەوکات بمردمایە لە دۆزەخ دەبووم، دواتر بەیعەتم دا بە پێغەمبەر (ﷺ) و لە هەموو کەس زیاتر شەرمم لێدەکرد تا ئەوەی نەمتوانی تێری چاوم تەماشای بکەم، ئەگەر ئەو کات بمردمایە خەڵکی دەیانوت خۆشی بۆ عەمر کە لەسەر خێر و چاکە مردو هیوامان وایە لە بەهەشت بێت، دوای ئەوە دەستم گەیشتە دەسەڵات و ئیتر نازانم چاکە بۆم یان خراپ، ئەگەر بمرم کەسێ بۆم ناگری... کە مردم دارو بەرد لەسەر گۆڕم دامەنێن، کە داتانپۆشیم هێندەی سەربڕینی وشترێك لام بمێننەوە.[٢]

١ - البداية و النهاية لابن كثير، ج٨، ص ٢٥.

٢ - صحيح مسلم، الرقم ١٩٨، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٧٤٤٦.

## بیست و هەشتەم: ماڵئاوایی زەیدی کوڕی حارثە (رضي الله عنه)

زەیدی کوڕی حارثەی کوڕی شەراحیل هێشتا بچووك بوو کە لەگەڵ سەعدی دایکی چوو بۆ لای هۆزەکەی دایکی، لەو ماوەدا هێرش کرایە سەر ئەو هۆزەو تیایدا زەید بەدیل گیرا و دواتر برا بۆ بازاڕی عوکاظ و لەوێ فرۆشرا، حەکیمی کوڕی حیزام زەیدی کڕی بۆ خەدیجەی پووری، بە چوارسەد درهەم ئەوی کڕی، ئیتر زەید لای خەدیجە مایەوە تا ئەوەی خەدیجە شووی کرد بە پێغەمبەر (ﷺ)، ئەوکات بەخشی بە پێغەمبەر (ﷺ).[1]

پێغەمبەر (ﷺ) خۆشەویستی زۆر بوو بۆ زەید، جا کاتێك خەدیجەی هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) بینی پێغەمبەر (ﷺ) زەیدی زۆر خۆشدەوێت زەیدی بەخشی بە پێغەمبەر (ﷺ).[2]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کە دەستەیەك لە هۆزەکەی زەید هاتن بۆ حەج و لەوێ زەیدیان بینی و یەکتریان ناسیەوە، هەواڵیان برد بۆ باوکی و ناونیشانیان پێدا، باوکیشی هاودەم بە کەعب هات بۆ مەککەو پرسیاری پێغەمبەری خوایان (ﷺ) کرد و وتیان لە مزگەوتە، ئەوانیش چوون بۆ لای و وتیان تۆ گەورەی هۆزەکەتی و خەڵکی شارێکیت کە کەعبەی تێدایە، دەستگرۆی نەدار و نانبەخشن، هاوتین تا ئەو کۆیلەت کە هەتە کوڕی ئێمەیە منەتبارمان بکەیت و ئازادی بکەیت و لە بەرامبەردا چیت دەوێت پێت

١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٥٩٨.

٢ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٤.

دەبەخشین، ئەویش فەرمووی: کامەیە؟ وتیان زەید، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بانگی بکەن و سەرپشکی بکەن، ئەگەر ئێوەی هەڵبژارد ئەوە بەبێ هیچ بەرامبەرێك بۆ ئێوەو ئەگەریش منی هەڵبژارد ئەوە بە خوا من کەسێك دوورناخەمەوە کە من هەڵبژێرێت، ئەوانیش وتیان زۆر لەوە زیاترت پێ بەخشیوین کە ئێمە داوامان کردووە، ئەوەبوو هێنرا و پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەمانە دەناسیت؟ وتی بەڵێ، ئەوە باوکمەو ئەوەش مامەمە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی زەید من ئەوەم کە دەمناسیت و هاوەڵیت کردوم، جا یان من هەڵبژێرە یان ئەو دوانە هەڵبژێرە، زەید وتی تەنها تۆ هەڵدەبژێرم، تۆ بۆ من وەك باوك و مامیش بویت، باوکی و مامی وتیان ماڵوێران کۆیلایەتیت پێ خۆشە تا ئازادی و هاودەمی باوکت و مام و کەسوکارت؟ زەید وتی بەڵێ، من شتێکم لەم پیاوە بەدیکردووە کە ئیتر بڕیارم داوە جگە لەم کەس هەڵنەبژێرم، پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەمەی بینی بردیەوە ناو ژوورەکەی و فەرمووی: شایەت بن زەید کوڕی منەو میراتم لێ دەگرێت و مێراتی لێدەگرم، کاتێك باوکی و مامی ئەمەیان بینی دەروونیان ئارامی گرت و چوون، ئیتر هەمیشە زەید بە ناوی زەیدی کوڕی موحەممەد بانگ دەکرا تا ئەوەی ئیسلام هات.[١]

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: زەیدی کوڕی حارثە هات بۆ مەدینە، ئەوکات پێغەمبەر (ﷺ) لە لای من بوو، زەید هات و تەقەی دا لە دەرگا،

---

١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٥٩٩.

پێغەمبەر (ﷺ) بەرەورووی هەستا و جلەکانی بەدوای خۆیدا رادەکێشاو باوەشی کرد بە زەیددا و ماچی کرد.[١]

پێغەمبەر (ﷺ) زەیدی لە هەر سریەیەکدا بناردایە دەیکرد بە ئەمیری سریەکە،[٢] ئەوەبوو لە حەوت سریەدا زەید ئەمیر بوو،[٣] ئەگەریش پێغەمبەر (ﷺ) بچوایەتە دەرەوەو زەید لە مەدینە بوایە ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) دەیکرد بە بەرپرسی مەدینە تا خۆی دەگەڕایەوە.[٤]

پێغەمبەر (ﷺ) زەیدی کوڕی حارثەی نارد بۆ شەڕی موئتە لە خاکی شام، ئەوەبوو لە مانگی جەمادیلئوولای ساڵی هەشتەمی کۆچیدا لەو غەزایەدا شەهید بوو.

موئتە لە خوارووی بەلقا بوو ماوەیەك دوور بوو لە شام، ئەوەبوو لە مانگی جەمادیلئوولادا پێغەمبەر (ﷺ) بە نامەیەکەوە حارثی کوڕی عومەیری ئەزدی نارد بۆ لای پاشای بوصرا، کەچی کە گەیشتە موئتە شورەحبیلی کوڕی عەمری غەسانی رێی پێ گرت و کوشتی، پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی لەسەر سەخت بوو، بۆیە سوپایەکی نارد کە نزیکەی سێ هەزار کەس دەبوون، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ئەمیری خەڵکەکە زەیدی کوڕی حارثەیە، ئەگەر کوژرا ئەوە

---

١ - سنن الترمذي، الرقم ٢٧٢٧، ضعفه الألباني في تحقيق رياض الصالحين، الرقم ٨٩٦.

٢ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٦٠١.

٣ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٢٢٦.

٤ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٦٠١.

جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب ئەمیرە، ئەگەر ئەویش کوژرا ئەوە عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە ئەمیرە، ئەگەر ئەویش کوژرا با موسڵمانان بە ڕەزامەندی خۆیان لەنێو خۆیاندا کەسێك دیاری بکەن و بیکەنە ئەمیریان)، پێغەمبەر (ﷺ) ئاڵایەکی سپی دایە دەست زەیدی کوڕی حارثەو وەسیەتی کرد بۆیان تا بچنە شوێنی کوژرانەکەی حارثی کوڕی عومەیر و خەڵکی ئەوێ بانگ بکەن بۆ ئیسلام، ئەگەر موسڵمان بوون باشە، ئەگەرنا پشت بەخوا ببەستن و دژیان بجەنگن، خۆیشی بۆ بەڕێکردنیان لەگەڵیان چوو تا گەیشتە (ثنیة الوداع)، ئیتر لەوێ وەستا و ماڵئاوایی کرد لێیان، موسڵمانانیش نزایان دەکرد بۆیان و دەیانوت خوا بتانپارێزێ و بە چاکی و دەستکەوتەوە بتانگێڕێتەوە، دوژمنیش ئەم هەواڵەی بیست و سوپای کۆکردەوەو شورەحبیل نزیکەی سەد هەزار سەربازی کۆکردەوەو دەستەی پێشڕەوی نارد.

کاتێك موسڵمانان گەیشتنە خاکی شام و هەواڵی زۆری سوپای دوژمن و هاتنی هیرەقلیشیان بە سوپایەکەوە بیست کە نزیك لەو ناوچە بوو، وتیان با نامە بنێرین بۆ پێغەمبەر (ﷺ) تا بزانین فەرمان بە چی دەکات، بەڵام عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە موسڵمانانی هاندا تا درێژە بدەن بە چوونەکەیان، ئەوەبوو درێژەیان دا بە چوونەکەیان تا گەیشتنە موئتە، دوژمنیش بە سوپایەکی گەورەوە هاتن و جەنگ لەنێوانیاندا روویدا، زەید بە ئاڵاکەوە جەنگا تا رمێکی بەرکەوت و شەهید بوو، ئینجا جەعفەری کوڕی ئەبووطالیب ئاڵاکەی گرتەدەست و لەسەر ئەسپەکەی دابەزی و دەمارێکی پێی ئەسپەکەی بڕی تا

نیشانی بدات راکردن نیە، ئینجا جەنگا تا سەربازێکی رۆمی بە شمشێر لێیدا و وا لێیدا کردی بە دوو بەشەوە، یەکێك لە بەشەکانی جەستەی نزیکەی سی و ئەوەندە برینداری پێوە بوو، بە هەموو جەستەیەوە نزیکەی حەفتاو ئەوەندە برینداری بینرا چ لە بەرکەوتنی شمشێر یان رم بێت، ئینجا عەبدوڵای کوڕی رەواحە ئاڵاکەی هەڵگرت و ئەویش جەنگا تا کوژرا، ئینجا موسڵمانان ئاڵاکەیان دایە دەست خالیدی کوڕی وەلید و ئەویش بە پلانێکی سەرکەوتوو توانی پاشەکشە بکات بە سوپای موسڵمانان.[1]

کاتێك جەعفەر ئاڵاکەی بەدەستی راستەوە گرتبوو شمشێرێك درا لە دەستی و دەستی بڕا، بۆیە بە دەستی چەپ ئاڵاکەی گرتە دەست، پاش کەمێکی تر درا لە دەستی چەپیشی و هەردوو دەستی بڕا.[2]

کاتێك ئەم رووداوانە روویاندەدا پێغەمبەر (ﷺ) لە مەدینە لەلایەن پەروەردگارەوە هەواڵی پێدەدراو دەیگێڕایەوە بۆ هاوەڵان.[3]

کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی کوژرانی جەعفەر و زەید و عەبدوڵای کوڕی رەواحەی بیست دانیشت و خەفەت دەموچاوی داگرتبوو،[4] ئینجا

١ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ١٢٨-١٢٩.

٢ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ٢٤٦.

٣ - المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٣٨٤٣.

٤ - صحيح البخاري، الرقم ١٢٥٠، صحيح مسلم، الرقم ١٦٠٢، صحيح ابن حبان، الرقم ٣٢٠٤، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ١٩٥٣، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ٦٦٧٨، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٣٧٥٥.

دەیفەرموو: (وایە لە زەید خۆش بیت، خوایە لە زەید خۆش بیت، خوایە لە زەید خۆش بیت، خوایە لە جەعفەر خۆش بیت، لە عەبدوڵای کوڕی رەواحە خۆش بیت).[١]

پێغەمبەر (ﷺ) چوو سەردانی ماڵی زەیدی کرد، کچەکەی زەید هەنیسکی گریان گرتبووی و بە گریانەوە رووەو پێغەمبەر (ﷺ) چوو، پێغەمبەریش (ﷺ) زۆر بە تاسەوە دەستی کرد بە گریان، سەعدی کوڕی عوبادە کە لەوێ بوو وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو گریانە چیە؟ فەرمووی: (ئەوە تاسەی خۆشەویستە بۆ خۆشەویستەکەی).[٢]

کاتێك زەید شەهید بوو تەمەنی پەنجاو پێنج ساڵ بوو.[٣]

١ - مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ١١٧٦٩،

٢ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٦.

٣ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٦٠١.

## بیست و نۆیەم: ماڵئاوایی عەمماری کوڕی یاسر (رضي الله عنه)

عەمماری کوڕی یاسری کوڕی عامیری کوڕی مالیکی عەنەسیە، کونیەکەی ئەبولیەقظانە.[١]

هەریەك لە سومەییە و یاسری هاوسەری و عەمماری کوڕی لە یەکەمین موسڵمان بووەکان بوون.[٢]

کاتێك سومەییە موسڵمان بوو، ئەبووجەهل لەسەر موسڵمانبوونەکەی زۆر ئازاری دەدا، جلی ئاسنینی دەکردە بەری و لەبەر گەرمای مەککەدا سزای دەدا.

جارێك ئەبووجەهل کە سزای سومەییەی دەدا، هات و بە خەنجەرێك دای لە سکی و شەهیدی کرد.[٣]

لە جەنگی بەدردا کە ئەبووجەهل کوژرا، پێغەمبەر (ﷺ) بە عەمماری فەرموو (خوا بکوژەکەی دایکتی کوشت).[٤]

١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ٥٧٥.

٢ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٧١٢.

٣ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧،ص ٧١٢.

٤ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٢٦٤.

عەمماری کوڕی یاسر یەکێك بوو لەو حەوت کەسە یەکەمەی کە لە مەککە ئیمانی خۆیان ئاشکراکرد، ئەوانیش بریتی بوون لە پێغەمبەر (ﷺ) و ئەبووبەکر و بیلال و صوهەیب و خەبباب و عەممار و سومەییە.[١]

کاتێك یاسر و سومەییە و عەممار لەسەر ئیسلامەتییان سزا دەدران، پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو (صبرا یا آل یاسر، موعدکم الجنة)،[٢] (خۆڕاگر بن ئەی خێزانی یاسر، وادەتان بەهەشتە).

بێباوەڕان هێندە سزای عەمماریان دا تا ناچاریان کرد قسە بڵێت بە پێغەمبەر (ﷺ)، ئینجا وازیان لێهێنا، دواتر کە عەممار چوو بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمووی خەبەر چیە؟ وتی خراپە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وازم لێنەهێنرا تا قسەم بە تۆ وت و بە چاکە باسی خواوەندەکانی ئەوانم کرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (دڵت چۆن بوو؟) وتی تەواو دڵنیایە بەئیمان، فەرمووی (فإن عادوا فعد)،[٣] (ئەگەر هەمدی ناچاریان کردی وا بکەرەوە)

عەممار یەکەم کەس بوو لە ئیسلامدا مزگەوتی دروست کرد، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) لە رێی کۆچدا بوو، عەممار وتی دەبێت شوێنێك هەبێت بۆ

---

١ - أسد الغابة، ج٣، ص ٤٠.

٢ - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٥٦٢٦، قال الألباني في فقه السيرة (١/١١١) حديث حسن صحيح.

٣ - السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٥٧١٦، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٣٢٩٥، صححه الذهبي في التلخيص.

سێبەر و نوێژکردنی پێغەمبەر (ﷺ)، بۆیە بە بەرد مزگەوتی قوبائی دروست کرد.[1]

عەممار کۆچی کرد بۆ مەدینەو لە هەریەك لە غەزاکانی بەدر و ئوحود و خەندەق و بەیعەتی ریضوانیشدا بەشداری کرد.[2]

خالید دەڵێت جارێك لەگەڵ عەمماری کوڕی یاسردا دەمەبۆڵەیەکمان بوو، عەمماریش چوو تا لای پێغەمبەر (ﷺ) سکاڵام لەسەر بکات، منیش هەر لێی تووڕە دەبووم، پێغەمبەریش (ﷺ) بێدەنگ بوو، ئیتر عەممار دەستی کرد بە گریان و وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) گوێت لێیە چیم پێ دەڵێت؟ پێغەمبەریش (ﷺ) سەری بەرەو رووی من بەرزکردەوەو فەرمووی (هەرکەس دژایەتی عەممار بکات خوا دژایەتی دەکات و هەرکەسیش رقی لێی بێت خوا رقی لێی دەبێت)، منیش خێرا دەرچووم و ئیتر لەو ساتەوە هیچ شتێك هێندەی ئەوە لام خۆشەویست نەبوو کە عەممار رازی بکەم، خێرا خۆم گەیاند بە عەممار و رازیم کرد.[3]

---

١ - أسد الغابة، ج٤، ص ١٤٣.

٢ - أسد الغابة، ج٤، ص ١٤١.

٣ - صحيح ابن حبان، الرقم ٧١٩٠، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٥٦٥٧، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٧٩٩٤، مسند احمد بن حنبل، الرقم ١٦٤٩٢، صححه شعيب الأرناؤوط، كما صححه الألباني في صحيح الجامع الصغير و زيادته.

عەلی کوڕی ئەبووطالیب دەڵێت جارێك لە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) دانیشتبووین کە عەممار هات و داوای مۆڵەتی کرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (مۆڵەتی بدەن، مەرحەبا لە پاکی پاکی پێبەخشراو).[١]

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی (عمار ما عرض عليه أمران إلا اختار الأرشد منهما)،[٢] (عەممار هەر کات دوو پرسی بۆ بخرێتە روو، ئەوە دروستترینیان هەڵدەبژێرێت).

لە سەردەمی عەلی کوڕی ئەبووطالیبدا عەممار کەسی نزیك و هاودەم و پشتگیری خەلیفە بوو، تەنانەت بۆ بێدەنگکردنی نەیارەکانی هەوڵی زۆری دا، لە هەریەك لە جەنگی جەمەل و صفیشنیش بەشداری کرد و دواجار لە جەنگی صفیندا شەهید بوو.[٣]

پێش ئەوەی جەنگی صفین روویدات، عەممار داوای بڕێك شیری کردو وتی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی (کۆتا خواردنەوە لە دنیادا دەیخۆیتەوە شیرە)،

١ - سنن ابن ماجة، الرقم ١٤٥، صحيح ابن حبان، الرقم ٧١٨٤، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٥٦٤٧، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٧٥٦، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم ٣٨٦، سنن الترمذي، الرقم ٣٨١٥ و قال حسن صحيح، صححه الذهبي في التلخيص، كما صححه أحمد شاكر، كما صححه شعيب الأرناؤوط، كما صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن بن ماجة، الرقم ١٤٦.

٢ - سنن ابن ماجة، الرقم ١٤٧واللفظ له، سنن الترمذي، الرقم ٣٨١٦، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٨٠٠١، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٤٢٦٦، صححه شعيب الأرناؤوط، كما صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن ابن ماجة، الرقم ١٤٨.

٣ - أسد الغابة، ج٤، ص ١٤٤.

ئەوەبوو شیری بۆ هێنرا و شیرەکەی خواردەوە، دواتر کە چووە ناو جەنگەکەوە کوژرا.[١]

لە رۆژی هەینیدا سوپای عێراق بە سەرکردایەتی عەمماری کوڕی یاسیر و سوپای شام بە سەرکردایەتی عەمری کوڕی عاص بەریەککەوتن و جەنگێکی سەخت لە نێوانیاندا روویدا، دواتر گەڕانەوە، ئینجا لە رۆژی شەممەشدا دووبارە جەنگ روویدا، بەو جۆرە چەند رۆژێك جەنگ روویدا تا دواجار عەممار شەهید کرا.[٢]

سەبارەت بە بکوژەکەی عەممار راجیایی هەیە، رایەك دەڵێت ئەبولغادیەی موزەنی بووە، شمشێرێکی دا لە عەممار و دواتر کەسێکی تر خۆی دا بەسەریدا و سەری عەمماری لێکردەوەو دواتر هەرکامیان دەیوت من کوشتوومە، عەمری کوڕی عاصیش وتی بەخوا ئەمانە لەسەر دۆزەخ جەنگیانە، خۆزگە بیست ساڵ لەمەوبەر دەمردم، رایەکیش دەڵێت بەڵکو عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنی و عەمری کوڕی حارث و شریکی کوڕی سەلەمە پێکەوە کوشتیان.[٣]

١ - مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٨٤٩٥، دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ٢٧٢٠، صححه شعيب الأرناؤوط.

٢ - البداية و النهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٦٢-٢٦٨.

٣ - أسد الغابة، ج٤، ص ١٤٥.

شەهیدکردنەکەشی لە ساڵی سی و حەوتی کۆچیدا بوو، لە جلەکانی خۆیدا کفن کرا، کاتێك عەممار شەهید کرا تەمەنی نزیکەی نەوەدو یەك یان نەوەد و سێ یان نەوەدو چوار ساڵ دەبوو.[١]

قەیسی کوڕی عەبباد دەڵێت بە عەممارم وت ئەرێ ئەم بەرگریەتان لە عەلی رایەکی خۆتانە یان بەڵێنێکە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) پێتان درا؟ ئەویش وتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەنها ئەو بەڵێنەی بەو داوە کە بە هەموو خەڵکی داوە، واتە هیچی تایبەت نەکرد بە عەلی.[٢]

خوزەیمە تا سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبوو طالیب ژیا، لە فیتنەی نێوان هاوەڵاندا بەشداری نەکرد، بەڵکو شمشێرەکەی لە کالان نابوو، لە جەمەلدا هەرچەندە ئامادە بوو بەڵام شمشێری لە کالان دەرنەکرد،[٣] بەڵام کاتێك لە جەنگی صفیندا بینی عەمماری کوڕی یاسر کوژرا، پێشتر دەیوت جەنگ ناکەم تا بزانم کێ عەممار دەکوژێت، هەرکەس کوشتی ئەوکات دەجەنگم، چونکە بیستوومە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: دەستەی باغی عەممار دەکوژن، کە عەممار کوژرا خوزەیمە وتی وا گومڕایی و نەپێکانم بۆ روون بوویەوە، شمشێری لە کالان دەرکرد و جەنگا تا کوژرا،[٤] واتە

---

١ - أسد الغابة، ج٤، ص ١٤٥.

٢ - صحيح مسلم، الرقم ٥٠٨٩.

٣ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٢٥٩.

٤ - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٥٦٤١.

خوزەیمە حوکمی عەلی پێ ڕەوا و دروست بوو و لەناو ریزی سوپای ئەودا مایەوەو کوژرا.[١]

## سیهەم: ماڵئاوایی عوثمانی کوڕی مەظعون (رضي الله عنه)

عوثمانی کوڕی مەظعوون یەکێکە لە کۆچەران، چواردەهەم کەس بوو لە مەککە موسڵمان بوو، بەشداری کرد لە کۆچی حەبەشەدا و هاودەم بە خۆیشی سائیبی کوڕیشی بەشداری کرد.

عوثمانی کوڕی مەظعوون لە غەزای بەدردا بەشداری کرد، پاش غەزای بەدر لە ساڵی دووەمی کۆچیدا وەفاتی کرد.[٢]

ئوممولعەلائی ئەنصاری دەڵێت کاتێك کۆچەران دابەش کران بەسەر ماڵەکاندا، عوثمانی کوڕی مەظعوون لای ئێمە مایەوە، ئەوەبوو تووشی ئەو نەخۆشیە بوو کە بەهۆیەوە وەفاتی کرد، کە وەفاتی کرد شۆردراو لە جلەکانیدا کفن کرا، پێغەمبەر (ﷺ) هاتە ژوورەوە، وتم ڕەحمەتی خوات لێ بێت ئەی ئەبووسائیب، من شایەتیت بۆ دەدەم کە خوا ڕێزداری کردیت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی چووزانیت خوا ڕێزداری کردووە؟ وتم بە دایك و باوکمەوە بەقوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) جا ئیتر خوا کێ ڕێزدار دەکات؟ پێغەمبەر (ﷺ)

١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٧٨.

٢ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ٤٦١.

فەرمووی (ئەو وا مەرگی هات، من هیوای خێرم بۆی هەیە، سوێند بەخوا من پێغەمبەری خوام و نازانم چی پێ دەکرێت)، منیش وتم بەخوا ئیتر تەزکیەی کەس ناکەم.[١]

کاتێك روقییە وەفاتی کرد پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (الحقي بسلفنا عثمان بن مظعون)، (پەیوەست بە بە پێشینمان عوثمانی کوڕی مەظعوون)، پێشتر کە عوثمانی کوڕی مەظعوون وەفاتی کردبوو، ژنەکەی وتی بەهەشتت لێ پیرۆز بێت، پێغەمبەر (ﷺ) بە توورەییەوە تەماشای کرد و فەرمووی تۆ چووزانیت؟ ئەویش وتی ئەو سوارچاك و هاوەڵی تۆ بوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (سوێند بەخوا نازانم چی پێ دەکرێت)، ئیتر هاوەڵان ئەوەیان زۆر لەسەر سەخت بوو کە چۆن بۆ عوثمانی هاوەڵی هەرە چاك پێغەمبەر (ﷺ) وای فەرموو، بەڵام کاتێك روقییە مرد و پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی فەرموو ئیتر هاوەڵان تێگەیشتن.[٢]

---

١ - صحيح البخاري، الرقم ١١٩٨.

٢ - المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٨١٩٣، مسند الطيالسي، الرقم ٢٨٠٧.

## سی و یەکەم: ماڵئاوایی عیکریمەی کوڕی ئەبووجەهل (رضي الله عنه)

عیکریمە کەسێکی بێباوەڕ بوو و باوکیشی یەکێك بوو لە سەرکردەکانی بێباوەڕان، عیکریمە هاوشان بە باوکی لە غەزای بەدردا دژ بە موسڵمانان بەشداری کرد و تیایدا کوشتاری موسڵمانانی کرد، لەوانە رافیعی کوڕی موعەللای شەهید کرد.[١]

عیکریمە لە غەزای ئوحوددا دژ بە موسڵمانان بەشداری کرد، لەو غەزایەدا لە بەرەی چەپەوە سەد سوارە هەبوون کە عیکریمەی کوڕی ئەبوو جەهل سەرکردایەتی دەکرد.[٢]

لە غەزای خەندەقیشدا دووبارە دژ بە موسڵمانان بەشداری کرد.[٣]

دواتر عیکریمە موسڵمان بوو و هەتا دوای وەفاتی پێغەمبەریش (ﷺ) پەشیمانی دەردەبڕی کە بۆچی زووتر موسڵمان نەبووە، ئەوەبوو عیکریمە لە ساڵی پانزەی کۆچیدا بەشداری جەنگی یەرمووکی کرد و تیایدا شەهید بوو،[٤] لە کاتی جەنگەکەدا لە ئەسپەکەی دابەزی و کەوتە جەنگ، دەیان جار بریندار کرا تا دواجار شەهید کرا.[٥]

١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٤٤٥.
٢ - نفس المصدر، ج٤، ص ١٥.
٣ - البداية و النهاية لابن كثير، ج٤، ص ١١٢.
٤ - سير أعلام النبلاء للذهبي، ج١، ص ٣١٦.
٥ - مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ١٩١٢٧.

لەکاتی جەنگەکەدا موسڵمانان هاواریان لێ دەکرد لەخوا بترسەو رەحمێ بە خۆت بکە، ئەویش دەیوت من پێشتر بۆ لات و عوززا خۆم بەخت دەکرد، ئێستا لە رێی خوادام خۆم بپارێزم؟! بەخوا هەرگیز شتی وا ناکەم.[١]

## سی و دووەم: مالْئاوایی فاطیمەی کچی ئەسەد (رضي الله عنها)

فاطیمەی کچی ئەسەد هاوسەری ئەبووطالیب و دایکی عەلی و ئامۆژنی پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، ئەم ئافرەتە هەر لە مەککە موسڵمان بوو و کۆچی کرد بۆ مەدینە و هەر لە مەدینەش وەفاتی کرد.[٢]

پێغەمبەر (ﷺ) دەچوو بۆ سەردانی فاطیمەی ئامۆژنی و لە ماڵی ئەویشدا خەوی پێش نیوەڕۆی دەکرد(قەیلولە).[٣]

جارێك پێغەمبەر (ﷺ) پارچە قوماشێکی دا بە عەلی کوڕی ئەبووطالیب و فەرمووی (بیکە بە سەرپۆش بۆ فاطیمەکان)، عەلیش کردی بە چەند پارچەیەکەوە، پارچەیەکی بۆ فاطیمەی دایکی و پارچەیەکی بۆ فاطیمەی هاوسەری و پارچەیەکیشی بۆ فاطیمەی کچی حەمزە.[٤]

---

١ - أسد الغابة، ج٤، ص ٨٠.

٢ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٨، ص ٦٠.

٣ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٨، ص ٦٠.

٤ - المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٢٠٧١٥.

کاتێك فاطیمەی دایکی عەلی وەفاتی کرد، پێغەمبەر (ﷺ) چوو لەلای سەریەوە دانیشت و وفەرمووی (رەحمەتی خوات لێ بێت دایە، تۆ دوای دایکم دایك بوویت بۆم، خۆت برسی دەکرد و منت تێر دەکرد، خۆت بێ بەرگ دەکرد و منت پۆشتە دەکرد، خواردنی خۆشت لەخۆت زەوت دەکرد و دەتدا بە من، مەبەستت بەمەش لەپێناو خواو رۆژی دواییدا بوو)، دواتر فەرمانی کرد سێ جار شۆردرا، کاتێك ئاوی کۆتا ئامادەکرا کە کافووری تێدا بوو کە تێکەڵەی رووەکێکی بۆنخۆش بوو، پێغەمبەر (ﷺ) خۆی ئاوەکەی بەسەردا کردو دواتر پێغەمبەر (ﷺ) جلەکەی خۆی داکەند و دای بەسەریدا و بەسەر ئەوەدا کفن کرا، دواتر پێغەمبەر (ﷺ) ئوسامەی کوڕی زەید و ئەبووئەییووبی ئەنصاری و عومەری کوڕی خەططاب و کۆیلەیەکی رەشپێستی بانگ کرد تا گۆڕی بۆ هەڵبکەنن، پێغەمبەر (ﷺ) چوویە ناو گۆڕەکەی و تیایدا راکشا وفەرمووی (خوا ئەو خوایەیە کە دەژیەنێت و دەمرێنێت و خۆیشی زیندووەو نامرێت، خوایە لە فاطیمەی کچی ئەسەدی دایکم خۆش بە و بەڵگەی بخەرە سەر زمان و گۆڕەکەی بۆ فراوان بکە، بە حەقی پێغەمبەرەکەت و پێغەمبەرانی پێش من، چونکە تۆ میهرەبانترینی میهرەبانانیت)، ئینجا چوار الله اکبری لەسەر کرد و پێغەمبەر (ﷺ) و عەبباس و ئەبووبەکری صدیق خستیانە ناو گۆڕەکەی.[١]

---

[١] - المعجم الاوسط للطبراني، الرقم ١٩٠.

## سی و سێهەم: ماڵئاوایی عەبدوڵای کوڕی زوبەیر (رضي الله عنه)

عەبدوڵای کوڕی زوبەیری کوڕی عەووامی ئەسەدی، یەکێکە لە هاوەڵە گەنجەکانی دەوری پێغەمبەر (ﷺ)،[١] لە یەکەم ساڵی کۆچیدا لەدایك بوو و یەکەم منداڵی لەدایکبووی کۆچەران بوو پاش کۆچ بۆ مەدینە.[٢]

عەبدوڵا تەمەنی نزیکەی حەوت یان هەشت ساڵان دەبوو کە زوبەیری باوکی بردی بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) تا بەیعەت بدات، پێغەمبەر (ﷺ) کە بینی وا عەبدوڵا دێت، بزەیەکی کرد و بەیعەتی لێوەرگرت.[٣]

عەبدوڵا لە سەردەمی عوثمانی کوڕی عەففاندا یەکێك بوو لەوانەی نوسخەکانی قورئانیان نووسیەوە.[٤]

پاش مردنی یەزید و هاتنی موعاویەی کوڕی کە پیاوێکی زۆر خواناس بوو و کەم ژیاو وەفاتی کرد و کەسی لە دوای خۆی دیاری نەکرد، ئیتر بۆشاییەك لە دەسەڵاتدا دروست بوو، ئەمە دەرفەتێکی باش بوو بۆ عەبدوڵا تا بەیعەتی پێ

---

١ - الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٣، ص ٩٠٥.

٢ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ٩٠.

٣ - المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٢٠١٩٨.

٤ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢١٧.

بدرێت و ببێتە خەلیفە،[١] لە مەککەوە خیلافەتی ڕاگەیاند و موسڵمانان کەوتنە بەیعەت پێدانی.[٢]

لە ساڵی حەفتاو دووی کۆچیدا عەبدولمەلیك حەججاجی کوڕی یووسفی نارد بۆ گەمارۆی مەککە تا دەسەڵاتەکەی ئیبن زوبەیر لەناوبەرێت، ئەمەش لەسەر داوای خودی حەججاج بوو،[٣] حەججاج ماوەی پێنج مانگ و نیو گەمارۆی مەککەی دا، بە مەنجەنیق کەوتە لێدانی مەککە و خەڵکێکی زۆری کوشت، ئاو و خۆراکیشی لێ قەدەغە کردبوون، هەندێ لە بەردەکان بەر کەعبەش کەوتن، خەڵکەکە داوایان لە عەبدوڵا کرد لەگەڵیان ڕێکبکەوێت، بەڵام ئەو وتی بەخوا ئەوانە ئەگەر لەناو کەعبەشدا بتانگرن سەرتان دەبڕن، بۆیە هەرگیز داوای ڕێککەوتنیان لێ ناکەم، خەڵکەکە بەردەوام دەچوون بۆ لای حەججاج و داوای پەنایان دەکرد و عەبدوڵایان جێدەهێشت تا ئەوەی حەمزەو خوبەیبی کوڕیشی جێیانهێشت، عەبدوڵا چوو بۆ لای دایکی و سکاڵای حاڵی خۆی کرد چۆن هەموو خەڵکەکە جێیانهێشت، دایکی هانیدا تا خۆڕاگر بێت چونکە ئەو نیازەکەی بۆ

---

١ - خوێنەری ئازیز، لەبەرئەوەی نووسینەکە تایبەت نیە بە وردەکاریە مێژووییەکانەوەو ئەگەر بۆ هەر هاوەڵێك ئەو وردەکاریانە بهێنین لەوانەیە دەیان بەرگی بوێت تا نوسینەکە تەواو بێت، بۆیە پوختەیەکی پێویست سەبارەت بە ماوەی دەسەڵات تا کوژرانی عەبدوڵای کوڕی زوبەیر دەخەینەڕوو و خوێنەر دەتوانێت بۆ زانیاری زیاتر سوود لەو نووسینانە وەربگرێت کە تایبەت بە ماوەی دەسەڵاتی عەبدوڵای کوڕی زوبەیر نووسراون و بە زمانی کوردیش بەردەستن.

٢ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٩، ص ٦٣.

٣ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٣٢٥.

قیامەت بووە، عەبدوڵا بەو وتانەی دایکی دڵخۆش بوو و چوو بەرگریەکی گەورەی کرد، لەو کاتەشدا هێشتا هەر شەونوێژی دەکرد، دواجار خشتێك کەوتەخوار و بەر سەری کەوت و سەری خوێناوی کرد و خستیە زەوی، خێرا دەستەیەك هاتن و کوشتیان و تەرمەکەیان برد بۆ لای حەججاج، دوای کوژرانی عەبدوڵا شیوەن مەککەی داگرت، بەڵام زۆرو زمانی حەججاج بێدەنگی کردن.[1]

کوژرانی عەبدوڵا لە نیوەی جومادیلئاخیرەی ساڵی حەفتاو سێی کۆچیدا بوو.[2]

کاتێك عەبدوڵای کوڕی زوبەیر کوژرا، تەرمەکەی لەخاچ درا تا خەڵك بیبینێت، کە عەبدوڵای کوڕی عومەر دای بە لای تەرمەکەیدا، وەستا و وتی سەلامت لێ بێت ئەبووخوبەیب، سێ جار ئەوەی وتەوە، ئینجا وتی بەخوا من زۆر رێگریم لێکردیت لەمە، سێ جار ئەوەشی وتەوە، بەخوا هێندەی من تۆم ناسیبێت کەسێك بوویت نوێژ و رۆژووت زۆرزۆر بوو و پەیوەندی خزمایەتیشت زۆر بەهێز راگرتبوو، بەخوا ئوممەتێك تۆ خراپترینی بیت چاکترین ئوممەتە، پاشان عەبدوڵای کوڕی عومەر چوو، ئینجا حەججاج ئەو هەڵوێستەی ئیبن عومەری بیست، ناردی تەرمەکەی عەبدوڵا داگیرایە خوارەوەو فڕێ درایە ناو گۆڕستانی جوولەکەکان، دواتر حەججاج ناردی بە شوێن ئەسمائی کچی ئەبوبەکری دایکی عەبدوڵادا، ئەسما ء ئامادە نەبوو بچێت بۆ لای، چەند جار

١ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٣٣٠-٣٣١.

٢ - أسد الغابة، ج٣، ص ٢٤٧.

نێردراوی نارد و ئەسمائیش نەچوو، حەججاج وتی دێیت یان کەسێك بنێرم بە پرچەکانت راکێشی ئێرەت بکات، ئەسمائیش هەر نەچوو و وتی بەخوا نایەم بۆ لات تا کەسێك نەنێریت کە بێت بە پرچەکانم راکێشم بکات، حەججاج خۆی چوو بۆ لای ئەسما ء وتی بینیت چیم کرد بە دوژمنی خوا-مەبەستی عەبدوڵای کوڕی بوو-؟ ئەسما ء وتی بینیم دنیای ئەو و قیامەتی خۆتت شێواند...پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو (لەناو ثەقیفدا درۆزنێك و خوێنڕێژێك دەردەکەون) جا درۆزنەکەمان بینی، بۆ خوێنڕێژەکەش تەنها تۆ شك دەبەم، حەججاج کە ئەوەی بیست هەستا و ئیتر نەهاتەوە بۆ لای ئەسما ء.[١]

١ - صحيح مسلم، الرقم ٤٧٢٢، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٣٦٤٩.

## سی و چوارەم: ماڵئاوایی موصعەبی کوڕی عومەیر (رضي الله عنه)

موصعەبی کوڕی عومەیر یەکێکە لە دەستەی یەکەمی موسڵمانبوان، بەڵام لە ترسی دایکی ئیمانداریەکەی خۆی شاردەوە تا ئەوەی عوثمانی کوڕی طەلحە پێی زانی و بە دایك و کەسانی وت کە موصعەب موسڵمان بووە، ئەوەبوو ئەوانیش موصعەبیان لە ماڵەوە بەستەوە تا دەرفەتی بۆ گونجا و رایکرد و کۆچی کرد بۆ حەبەشە.[١]

موصعەب دواتر گەڕایەوە بۆ مەککەو دوای ئەوە کۆچی کرد بۆ مەدینە.[٢]

پشتیوانان داوایان لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد کەسێکیان بۆ بنێرێ تا قورئانیان فێر بکات، ئەویش موصعەبی کوڕی عومەیری نارد، موصعەبیش لە ماڵی ئەسعەد دابەزی،[٣] ئیتر بوونە هاریکاری یەکتر بۆ خزمەتی پەیامی خواو ریشەکێکردنی رەگی بتپەرستی.

موصعەب یەکێکە لە بەشداربوانی غەزای بەدرو دواتریش لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد و ئاڵای موسڵمانانی بەدەستەوە بوو و تیایدا شەهید بوو.[٤]

---

١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٦، ص١٢٣.

٢ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٦، ص١٢٣.

٣ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص١٤٩.

٤ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٦، ص١٢٣.

لە غەزای ئوحوددا پێغەمبەر (ﷺ) ئاڵایەکی دابوویە دەست عەلی کوڕی ئەبووطالیب، بەڵام دواتر ئاڵاکەی لەو وەرگرت و دای بە موصعەبی کوڕی عومەیر.[١]

موصعەب لە دەوری پێغەمبەر (ﷺ) بوو و دەجەنگا تا کوژرا، کابرایەك کوشتی کە وایزانی پێغەمبەری خوای (ﷺ) کوشتووە و بەپەلە بە قوڕەیشیەکانی وت موحەممەدم کوشت، کەچی موصعەبی شەهید کردبوو، دواتر پێغەمبەر (ﷺ) ئاڵاکەی دایەوە دەست عەلی.[٢]

کاتێك غەزای ئوحود تەواو بوو و پێغەمبەر (ﷺ) دای بە لای تەرمی موصعەبدا، وەستا و نزای بۆ کرد و دواتر ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ رِجَالٞ صَدَقُواْ مَا عَٰهَدُواْ ٱللَّهَ عَلَيۡهِۖ فَمِنۡهُم مَّن قَضَىٰ نَحۡبَهُۥ وَمِنۡهُم مَّن يَنتَظِرُۖ وَمَا بَدَّلُواْ تَبۡدِيلٗا ﴿٢٣﴾ ﴾، دواتر فەرمووی (شایەتی دەدەم ئەمانە لای خوا لە رۆژی دواییدا شەهیدن).[٣]

کە موصعەب شەهید بوو جلێکی وا نەبوو بۆ کفنەکەی بەکار بێت، تەنها دوو جلی جێهێشتبوو، کە سەریان دادەپۆشی قاچی دەردەکەوت و کە قاچیان

---

١ - البداية و النهاية لابن كثير، ج٤، ص ٢٠.

٢ - سير أعلام النبلاء للذهبي، ج١، ص ١٤٨.

٣ - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٢٩٠٩، دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ١١٥٩، قال الذهبي في التلخيص أحسبه موضوعا.

دادەپۆشی سەری دەردەکەوت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد بە گەڵا قاچی دابپۆشن.[١]

حەمنە دەڵێت –لە جەنگی ئوحوددا– پێم وترا براکەت کوژرا، وتم إنا لله و إنا إليه راجعون، وتیان مێردەکەشت کوژرا، وتم ئای چەند بەداخ و خەفەتە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (إن للزوج من المرأة لشعبة ما هي لشيء)،[٢] (ئافرەت هاوخۆبوونێکی هەیە بۆ پیاو کە بۆ کەسی تر نیەتی)، پێغەمبەر (ﷺ) بە حەمنەی فەرموو بۆچی وات وت بۆ موصعەبی مێردت؟ ئەویش وتی ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئاخۆ هەتیوکەوتنی منداڵەکەیم هاتەبەرچاو.[٣]

١ - صحيح ابن حبان، الرقم ٧١٢٩، صححه ابن حجر في الإصابة، ج٦، ص ١٢٣.

٢ - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٦٩٧١، سكت عنه الذهبي، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ٦٧٢٤، سنن ابن ماجة، الرقم ١٥٨٥، ضعفه الألباني في صحيحي و ضعيف سنن ابن ماجة، الرقم ١٥٩٠.

٣ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٢٤١.

## سی و پێنجەم: ماڵئاوایی ئەبوزەری غیفاری (رضي الله عنه)

ئەبووزەری غیفاری کە ناوی جوندوبی کوڕی جونادە یە، لە دەستەی یەکەمی موسڵمان بوانە،[١]

ئەبووذەر لە سەردەمی نەفامیشدا بڕوای بە بتەکان نەبوو و باسی بوونی خوایەکی تاك و تەنهای دەکرد.[٢]

سەبارەت بەوەی ئەبووذەر چەندەم کەس بووە موسڵمان بووە رایەك دەڵێت چوارەم کەس بووە، رایەکی تریش دەڵێت پێنجەم کەس بووە موسڵمان بووە.[٣]

پێغەمبەر (ﷺ) پێی دەفەرموو ( یا أباذر إني أراك ضعيفا، وإنی أحب لك ما أحب لنفسي، لا تأمرن على إثنين ولا تولين مال يتيم)[٤] (ئەی ئەبووذەر من تۆ بە لاوازی دەبینم، ئەوەشی بۆ خۆم خۆشم دەوێت بۆ تۆیش حەزم پێیە، دەی بەرپرسیارێتی دوو کەسیش مەگرە ئەستۆ و ماڵ و سامانی هەتیویش مەگرە ئەستۆ)

یەکێك لەو مەسەلانەی کە کراوە بە رەخنە لەسەر عوثمانی کوڕی عەففان و تانەدان لە خیلافەتەکەی، مەسەلەی چوونی ئەبووذەر بوو بۆ ناوچەی رەبذە،

---

١ - أسد الغابة، ج١، ص ٤٤٠.

٢ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٢٢٢.

٣ - الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٥٢.

٤ - صحيح مسلم، الرقم ٣٤٩٣، سنن أبي داوود، الرقم ٢٤٩٩، صحيح ابن حبان، الرقم ٥٦٤١، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٦٢٩٦، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٨٧٨٨.

چونکە ئەو تۆمەتەی ئاراستە کراوە کە ئەو بە زۆر و بە فەرمان ئەبووذەری دوورخستوەتەوە بۆ ناوچەی رەبذە.

ئیبنولعەرەبی سەبارەت بەم مەسەلەیە دەڵێت:

سەبارەت بەوەی گوایە ئەبووذەری دوورخستبێتەوە بۆ ناوچەی رەبذە ئەوە راست نیەو وای نەکردووە، ئەبووذەر کابرایەکی دنیانەویست و زاهید بوو و سەرکۆنەی کاربەدەستەکانی عوثمانی دەکرد.

عەسکەری دەڵێت: ئەبووذەر خۆی لەبەر زوهد و دوورگرتنی لەو سامانەی لە دەستی خەڵکدایە چوون بۆ رەبذەی هەڵبژارد.[1]

ئیبن خەلدوون دەڵێت: ئەبووذەر داوای مۆڵەتی کرد لە عوثمان تا لە مەدینە بچێتە دەرەوە، عوثمانیش مۆڵەتی دا و ئەبووذەریش چوو لە رەبذە دابەزی و لەوێ مزگەوتێکی بنیاد نا و عوثمانیش وشتری پێدا و دوو مەملووکی- خزمەتکاری- بۆ دانا و مووچەشی بۆ بڕیەوە،[2] هەروەها عوثمان پەیامی نارد بۆ ئەبووذەر و پێی وت جارجارە سەردانی مەدینە بکە تا نەریتی دەشتەکیەکان وەرنەگریت، ئەویش بە گوێی کرد.[3]

---

١ - الأوائل للعسكري، ج١، ص ٥٥.

٢ - تاريخ ابن خلدون، ط٥، دار القلم (بيروت-١٩٨٤)، ج٢، ص ٥٨٨.

٣ - تأريخ الطبرى، ج٢، ص ٦١٦.

مردنی ئەبووذەر لە ساڵی سی و دووی کۆچی و لە مانگی ذیلحیججەدا بوو،[١] ئیبن مەسعوودیش نوێژی مردووی لەسەر کرد، چونکە ئەوکات ئیبن مەسعوود لە مەدینەوە بەرەو کووفە دەچوو، داوا کرا لە ئیبن مەسعوود نوێژی لەسەر بکات، ئەویش وتی ئەوە کێیە؟ وترا ئەبووذەرە، ئەویش گریانێکی زۆر گریا و وتی برا و کەسی خۆشەویستم بە تەنها ژیا و بە تەنها مرد و بە تەنهاش زیندوو دەکرێتەوە، خۆشبەختی بۆ خۆی.[٢]

کاتێك ئەبووذەر لەسەرەمەرگدا بوو ژنەکەی دەستی کرد بە گریان، ئەبووذەر وتی بۆچی دەگریت؟ وتی لەبەرئەوەی کە هەر دەبێت من کفنت بکەم و هیچ جل و بەرگێکم لا نیە تا پێی کفنت بکەم، ئەویش وتی مەگری چونکە بیستوومە لە پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژێك کە لەگەڵ چەند کەسێکی تر لەلای بووم دەیفەرموو (لیموتن رجل منکم بفلاة من الأرض تشهده عصابة من المؤمنین)، (کەسێك لە ئێوە لە چۆڵەوانیەکی زەویەکدا دەمرێت، دەستەیەك لە موسڵمانان ئامادەی مەرگی دەبن)، دەی هەرکام لەوانەی ئەو ڕۆژە لەگەڵم بوون لە ناو کۆمەڵ و قەرەباڵغیدا مردن، ئیتر ئەوە منم کە لە چۆڵەوانیدا دەمرم، سوێند بەخوا درۆم نەکردووەو درۆشم لەگەڵ نەکراوە، دەی سەیرێکی ڕێگەکە بکە، ژنەکەشی وتی جا سەیری چی بکەم کە حاجییان چون و ڕێگەش بڕاوە، ئەویش وتی بڕۆ و جوان سەیر بکە، ژنەکەی زوو زوو دەچوو سەیرێکی ڕێگەکەی دەکرد و دەهاتەوە بۆ

---

١ - البدایة والنهایة لابن کثیر، ج٧، ص ١٦٥.

٢ - الإستیعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٥٣.

خزمەت کردنی ئەبووذەر، ئینجا تاوە تاوە دەچوویەوە سەیرێکی دەورووبەری دەکرد، تا جارێك خەڵکێکی بینی بە بارگەو بنەو وڵاخەوە دەهاتن، کە گەیشتنە لای وتیان ئەوە چیتە لێرە ئەی ئافرەت؟ ئەویش وتی کەسێکی موسڵمانان دەمرێت، وتیان کێیە؟ وتی ئەبووذەر، وتیان ئەبووذەری هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ)؟ وتی بەڵێ، ئەوانیش هەموو دەیانوت بە دایك و باوکمانەوە بەقوربانی بین، خێرا چوون بەرەو لای و چوونە لای، ئەویش بەخێرهاتنی ئەوانی کرد و وتی کاتێك من و چەند کەسێکی تر لای پێغەمبەر (ﷺ) بووین بیستم پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو (کەسێك لە ئێوە لە چۆڵەوانیەکی زەویەکدا دەمرێت، دەستەیەك لە موسڵمانان ئامادەی مەرگی دەبن)، دەی هەرکام لەوانەی ئەو رۆژە لەگەڵم بوون لە ناو کۆمەڵ و قەرەباڵغیدا مردن، ئیتر ئەوە منم کە لە چۆڵەوانیدا دەمرم، ئێوە گوێبیستی منن کە ئەگەر خۆم یان ژنەکەم پۆشاکێکمان هەبوایە بۆ کفن کردنم ئەوا بەو پۆشاکەی خۆم یان ژنەکەم کفن دەکرام، ئێوە گوێبیستمن کە من بەشایەتتان دەگرم یەکێك لە ئێوە کفنم بکات کە ئەمیر یان عەریف یان پۆستەچی یان نەقیب نەبووبێت، هەرکامیان یەکێك لەو سیفەتانەی تێدا بوو جگە لە گەنجێکی پشتیوانان کە وتی مامە گیان من کفنت دەکەم و هیچکام لەوانەشم نیە کە باست کرد، لەم عەبایەی خۆمدا کفنت دەکەم، هەروەها لە دوو پۆشاکی تریشمدا کە دایکم بۆی ئامادە کردبووم.[1]

١ - صحيح ابن حبان، الرقم ٦٧٧٩، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٥٤٤٤، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٠٩١٥، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٤٧٠، حسنه شعيب الأرناؤوط، كما حسنه الألباني في صحيح و ضعيف الترغيب و الترهيب، الرقم ٣٣١٤.

دوای ئەوەی نوێژی مردووی لەسەر کرا و ئەسپەردە کرا، ئینجا ئەو دەستەی موسڵمانان خێزانەکەی ئەبووذەریان بردەوە بۆ لای عوثمانی کوڕی عەففان،[١] عوثمانیش ژن و مناڵەکانی ئەبووذەری لەگەڵ ژن و مناڵەکانی خۆی دانا.[٢]

ئەبووذەر یەکێك بوو لەو کەسانەی کە زۆر فەرمانی دەکرد بە چاکەو ڕێگری دەکرد لە خراپە، لەبەر ڕەزامەندی خوا گوێی نەدەدا بە لۆمەی هیچ کەسێك.[٣]

١ - أسد الغابة، ج١، ص ٤٤٢.

٢ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٦٥.

٣ - تاريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص ٤٠٦.

## سی و شەشەم: ماڵئاوایی ئەبووسەلەمە (رضي الله عنه)

ئەبووسەلەمە مێردی ئومموسەلەمە بوو، یەکێك بوو لەبەشداربوانی غەزای بەدر، دواتریش لە غەزای ئوحوددا بەشداری کردو لە ئوحوددا بریندار بوو،[١] نزیکەی مانگێك برینێچی ئەو برینەی دەکرا تا باش بوو،[٢] پاش ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) لە مانگی صەفەردا ئەبووسەلەمەی کرد بە ئەمیری سریەیەك بۆ سەر بەنی ئەسەد، کاتێك لەو سریەیە گەڕایەوە برینەکەی جەنگی ئوحودی تەقی و لە مانگی جومادیلئاخیرەدا بەو هۆیەوە وەفاتی کرد.[٣]

ئومموسەلەمە بەسەرهاتی خۆی لەگەڵ ئەبووسەلەمە دەگێڕێتەوەو دەڵێت جارێك بە ئەبووسەلەمەم وت بیستوومە ئافرەت کە مێردەکەی مرد و لە دەستەی بەهەشتیەکان بوو و ئافرەتەکەش بەهەشتی بوو و شووی نەکردەوە، خوا لە بەهەشتدا کۆیان دەکاتەوە، بۆ پیاویش هەروا، دەی وەرە با من بەڵێنت پێ بدەم دوای تۆ شوو نەکەم و تۆیش دوای من ژن نەهێنیت، ئەبووسەلەمە وتی گوێڕایەڵم دەبیت؟ منیش وتم فەرمان بکە تا گوێڕایەڵت بم، عەبدوڵا وتی ئەگەر من مردم شوو بکە، دواتر وتی خوایە دوای من پیاوێکی باشتر ببەخشە بە

---

١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ١٥٤.

٢ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٨٧.

٣ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ١٥٤.

ئوممومسەلەمە کە دڵتەنگ و نارەحەتی نەکات، ئەوەبوو کە ئەبووسەلەمە مرد، پێغەمبەر (ﷺ) داوای ئوممومسەلەمەی کرد.[١]

ئوممومسەلەمە دەڵێت کە ئەبووسەلەمە مرد وتم دەبێت چ کەسێك هەبێت لە ئەبووسەلەمە باشتر بێت؟ یەکەم ماڵ بوو لەبەر خوا کۆچی کرد، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) حاطیبی کوڕی ئەبی بەلتەعەی نارد تا داوام بکات بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) منیش وتم من منداڵم هەیەو ئافرەتێکیشم غیرەم زۆرە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بۆ مناڵەکەی داوا لە خوا دەکەین خوا موحتاجی دەستی دایکی نەکات و داواش لە خوا دەکەم غیرەکەی لاببات.[٢]

١ - الطبقات الکبری لابن سعد، ج٨، ص ٨٨.

٢ - صحیح مسلم، الرقم ١٥٧٦.

## سی و حەوتەم: ماڵئاوایی ئەسعەدی کوڕی زوراره (رضي الله عنه)

ئەسعەدی کوڕی زوراره لە پشتیوانانەو لە خەزرەجیەکانە، ناسراوە بە (أسعد الخیر)، یەکەم کەسی پشتیوانان بوو کە موسڵمان بوو.

کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینە، خێرا ئەسعەد وشترەکەی پێغەمبەری (ﷺ) بردەوە بۆ لای خۆیو بە جوانی سەرپەرشتی دەکرد.[١]

ئەسعەد تووشی نەخۆشیەك بوو کە پێی دەوترا (الذبحة)، جوولەکەکان تانەیان دەدا لە پێغەمبەر (ﷺ) کە بۆچی چاکی ناکاتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) چوو بۆ لای تا سەردانی بکاتو سەیری حاڵی کرد، پاشان خۆی چارەسەی داخکردنی بۆ بەکارهێنا، بەڵام هەر مرد، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (مەرگێکی خراپ بەشی جوولەکە بێت، دەڵێن بۆ نەیتوانی دەردی هاوەڵەکەی بپەڕێنێ، من بۆ ئەو و بۆ خۆیشم هیچم پێ ناکرێ).

ئەسعەد وەسیەتی کرد دوای خۆی کچەکانی لەژێر چاودێری پێغەمبەردا (ﷺ) بن، بەوجۆرە کچەکانی زۆر تێکەڵی خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەبوون.[٢]

خوای گەورە بڕێ تایبەتمەندی بەم هاوەڵە خۆشەویستە بەخشی، لەوانە:

- یەکەم کەس بوو لەپشتیوانان موسڵمانان بوو.

---

١ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص٢٣٧، البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص٢٠٢.

٢ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٦١٠.

- بەشداری هەموو بەیعەتەکانی عەقەبەی کرد.
- یەکەم کەس بوو لە بەیعەتی عەقەبەدا دەستی خستە ناو دەستی پێغەمبەر (ﷺ).
- یەکەم کەس بوو لە مەدینە نوێژی هەینی بۆ موسڵمانان کرد.
- یەکەم موسڵمانی ناو مەدینە بوو کە دوای کۆچ وەفاتی کرد.
- پێغەمبەر (ﷺ) ئامادەی شۆردنو کفنکردنو ئەسپەردەکردنیشی بوو.
- یەکەم موسڵمان بوو لە مەدینە پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی مردووی لەسەر کرد.
- یەکەم موسڵمان بوو لە گۆڕستانی بەقیع ئەسپەردە کرا.
- پێغەمبەر (ﷺ) بە دەستی خۆی چارەسەری نەخۆشی بۆ ئەنجامدا.
- کچەکانی لەدوای خۆی لەژێر سەرپەرستی راستەوخۆی پێغەمبەری خوادا بوونو بەردەوام سەردانی ماڵی خێزانەکانی پێغەمبەریان (ﷺ) دەکرد.
- کاتێ وەفاتی کرد پێغەمبەر (ﷺ) ئەرکەکەی ئەوی گرتەئەستۆ کە نەقیبی بەنی نەجار بوو، ئەوەبوو دوای وەفاتی ئەسعەد پێغەمبەر (ﷺ) بە بەنی نەجاری راگەیاند ئەو دەبێتە نەقیبیان.
- لەناو نەقیبەکاندا تەمەنی لە هەموویان کەمتر بوو، بەڵام کاراترینو پێشرەوی هەموویان بوو.

## سی و هەشتەم: ماڵئاوایی موعاذی کوڕی جەبەل (رضي الله عنه)

موعاذی کوڕی جەبەل لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان، کونیەکەی ئەبووعەبدورەحمانەو یەکێکە لە هاوەڵە گەورە و دیارەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، کەسێکی باڵابەرز و کەشخە بوو، چاوەکانی گەورەو سپی رەنگ بوو.[١]

کاتێك موعاذ موسڵمان بوو، هێشتا تەمەنی هەژدە ساڵان دەبوو.[٢]

کاتێك موعاذ موسڵمان بوو، هاودەم بە ژمارەیەك گەنجی ناو پشتیوانان هەوڵیان دەدا گەورەکانی هۆزەکانیان تێبگەیەنن کە بتپەرستی هەڵەیە، بۆیە دەکەوتنە شکاندنی بتەکان بە نهێنی، تا خەڵکی بزانن ئەو بتانە هیچیان بۆ ناکرێت و تەنانەت ناتوانن بەرگری لە خۆیشیان بکەن.

هەریەك لە موعاذی کوڕی جەبەل و ثەعلەبەی کوڕی عەنمەو عەبدوڵای کوڕی ئەنیس پێکەوە دەچوون بتەکانی بەنی سەلەمەیان دەشکاند.[٣]

موعاذ لە غەزای بەدر[٤] و ئوحود و خەندەق و هەموو غەزاکانی تردا هاودەم بە پێغەمبەر (ﷺ) بەشداری کرد و لە تاکە غەزایەکیش دوانەکەوت.[٥]

١ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٤٤٤-٤٤٥.

٢ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٤٤٥.

٣ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٨٣.

٤ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٤٤٤.

٥ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٦، ص١٣٦.

یەکێك بوو لەو هاوەڵانەی لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) قورئانیان کۆدەکردەوە.[١]

کاتێك فەتحی مەککە کرا پێغەمبەر (ﷺ) موعاذی لە مەککە جێهێشت تا خەڵکی فێری قورئان خوێندن بکات.[٢]

لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) چوار کەس لە مزگەوتی پێغەمبەردا (ﷺ) فەتوایان دەدا کە بریتی بوون لە عومەری کوڕی خەططاب و عەلی کوڕی ئەبوو طالیب و موعاذی کوڕی جەبەل وئەبوو مووسای ئەشعەری.[٣]

لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا کاتێك موسڵمانان شامیان فەتح کرد، خەلیفە هەریەك لە عوبادەی کوڕی صامیت و موعاذی کوڕی جەبەل و ئەبوودەردائی نارد بۆ شام تا خەڵکی فێری قورئان بکەن و شارەزایان بکەن بە ئیسلام.[٤]

ئەبووعوبەیدە پێش ئەوەی وەفات بکات، لە کاتی نەخۆشیەکەیدا، لە شوێنی خۆیدا موعاذی کوڕی جەبەلی دانا تا ئەمیرایەتی خەڵکەکە بکات.[٥]

---

١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٦، ص١٣٧.

٢ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٤٤٧.

٣ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٣٨٩.

٤ - أسدالغابة، ج٣، ص ١٥٩.

٥ - أسد الغابة، ج٣، ص ١٢٧.

جا خەڵکەکە وتیان ئەی موعاذ لەخوا بپارێرەوە بەڵکو ئەم دەرد و پیسیەمان لەسەر لاببات، مەبەستیان نەخۆشی تاعوون بوو کە بڵاوبووبوویەوە، موعاذیش وتی ئەوە دەرد و پیسی نیە، بەڵکو نزای پێغەمبەرەکەتان و مەرگی پیاوچاکانەو شەهیدیەکە خوا تایبەتی دەکات بەهەرکامتان کە بتانەوێت...رۆژێك دێت ناحەقی تیایدا زاڵە، رۆژێ دێت خەڵکی دەڵێن بەخوا نازانم من کێم، نە لەسەر بەرچاوڕوونی دەژی و نە لەسەر بەرچاوڕوونی دەمرێت.[١]

ئینجا موعاذ فەرموودەیەکی گێڕایەوە بۆ خەڵکەکە سەبارەت بەو نەخۆشیەو وتی بیستم لە پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو (ستهاجرون إلى الشام فيفتح لكم ويكون فيكم داء كالدمل أو كالحرة يأخذ بمراق الرجل يستشهد الله به أنفسهم، ويزكي به أعمالهم)، (دواتر کۆچ دەکەن بۆ شام و فەتح دەکرێت بۆتان، لەنێوتاندا دەردێك دەردەکەوێت وەك دومەڵ یان حەررە و خوار ناوکی کەسەکە دەبات، خوا بەوە شەهیدی دەبەخشێت پێیان و بەوە کرداریان پاك رادەگرێت)، خوایە ئەگەر دەزانیت موعاذ ئەمەی لە پێغەمبەر (ﷺ) بیستووە دەی خوایە پشکی گەورەی ئەو نەخۆشیە ببەخشە بە خۆی و ژن و منداڵەکانی، ئەوەبوو تاعوون تووشی هەموویان بوو و هەموویان بەو هۆیەوە مردن.[٢]

---

١ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٤٥٧.

٢ - مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢١٥١٢، قال شعيب الأرناؤوط صحيح لغيره.

لە ساڵی هەژدەی کۆچی موعاذی کوڕی جەبەل بە نەخۆشی تاعوون کۆچی دوایی کرد، هاودەم بەویش چەند گەورە هاوەڵێکی دی بەو نەخۆشیە وەفاتیان کرد، وەك فەچلی کوڕی عەبباس و ئەبووعوبەیدەو شورەحبیلی کوڕی حەسەنەو ئەبوجەندەل.[١]

---

١ - البداية و النهاية لابن كثير، ج٦، ص ٢٠٢.

## سی و نۆهەم: ماڵئاوایی ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه)

ئەنەسی کوڕی مالیك لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان، خزمەتکاری پێغەمبەری خوا (ﷺ) بووو بەوەش ناسرابوو و خۆیشی شانازی پێوە دەکرد.[١]

جارێك ئومموسولەیم داوای کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) نزا بکات بۆ ئەنەس، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (اللهم أكثر ماله وولده وبارك له فيما أعطيته)،[٢] (خوایە سامانو منداڵی زۆر بکەو بەرەکەت بخەرە ئەوەوە بۆی کە پێی دەبەخشیت).

پێغەمبەر (ﷺ) زۆر ئەنەسی خۆشدەویستو زۆرجاریش قسەی خۆش و بزەبەخشی هەبوو بۆی، جارێك پێغەمبەر (ﷺ) بۆ بزەبەخشی بە ئەنەسی فەرمو (يا ذا الأذنين)،[٣] (ئەی دوو گوێ).

---

١ - أسد الغابة، ج١، ص١٩٢.

٢ - صحيح البخاري، الرقم ٥٩٨٤، صحيح مسلم، الرقم ١٠٩٠، سنن الترمذي، الرقم ٣٨٤٧، مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢٦٧٩٨، صحيح ابن حبان، الرقم ٧٢٨٥، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم ٣١٤٩، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٢١١٨٧.

٣ - سنن أبو داود، الرقم ٤٣٧٠، سنن الترمذي، الرقم ١٩٦٣، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٩٦٨٧، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١١٩٢٦، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم ٣٩١٨، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٦٦١، حسنه شعيب الأرناؤوط، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داود، الرقم٥٠٠٢.

پێغەمبەر (ﷺ) هێندە ئەنەسی خۆشدەویست جار هەبوو بە کوڕی شیرینم بانگی دەکرد وەك ئەنەس دەگێڕێتەوە دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرمووم (یا بني)،[١] (ئەی کوڕی شیرینم).

ئەنەس دەڵێت دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەری خوام (ﷺ) کرد چی کارێکی بەسەردا دابم، کردبێتم یان نا سەرکۆنەی نەکردوم، ئەگەریش کەسێك سەرکۆنەی بکردمایە دەیفەرموو وازی لێ بهێنن،[٢] لەریوایەتێکی تردا هاتووە دەڵێت دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەرم (ﷺ)کرد هەرگیز لێی نەدام و قسەی پێ نەوتم و رووی لێ گرژ نەکردم.[٣]

ئەبووهورەیرە دەڵێت کەسم نەدیوە هێندەی کوڕی ئومموسەلەمە –واتە ئەنەس– نوێژی لە نوێژی پێغەمبەر (ﷺ) بچێت.[٤]

ئەنەس لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا تووشی نەخۆشی(بەڵەکی) بووو تەواو جەستەی لاواز بوو بە جۆرێك نەیدەتوانی رۆژوو بگرێت،[٥] ماوەی یەك ساڵ پێش

---

١ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص٢٠.

٢ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص١٧.

٣ - سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص٣٩٨.

٤ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص٢٠، سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص٤٠٠، البدايةو النهاية لابن كثير، ج٥، ص٣٣٢.

٥ - تاريخ الإسلام للذهبي، ج٦، ص٢٩٥.

مردنی نەیتوانی ڕۆژوو بگرێت،[١] بۆیە تەشتێکی گەورە تشریبی ئامادە دەکرد و ٣٠ هەژاری بانگ دەکرد و نانی پێ دەدان.[٢]

ئەنەسی کوڕی مالیك ماوەیەك پێش مەرگی بەوانەی دەوروبەری دەوت تەلقینی لا إله إلا الله م پێ دابدەن، بەردەوام ئەوەی دەوت تا گیانی سپارد.[٣]

ئیمامی ذەهەبی دەڵێت: کۆتا هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) کە کۆچی دوایی کرد ئەنەسی کوڕی مالیك بوو.[٤]

ئەنەس وەسیەتی کردبوو کە موحەممەدی کوڕی سیرین تەرمەکەی بشوات، بەلام لەو کاتەدا موحەممەد لەبەر قەرزاریەك بەند کرابوو، بۆیە ئازاد کرا تا تەرمەکەی ئەنەسی شۆردو دواتر چوویەوە بۆ بەندیخانە.[٥]

سەبارەت بە کاتی وەفاتی چەند رایەك هەیە، رایەك دەڵێت لە ساڵی نەوەدی کۆچیدا وەفاتی کردووە، رایەکی تر دەڵێت لە ساڵی نەوەدو یەکی کۆچی بووە، رایەکی تر دەڵێت لە ساڵی نەوەدو سێی کۆچی بووە،[٦] کاتێ کۆچی دوایی کرد تەمەنی نەوەدو نۆ ساڵ بوو، رایەکی تر دەڵێت بەڵکو تەمەنی سەدو یەك ساڵ

---

١ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص١٩.

٢ - تاريخ الإسلام للذهبي، ج٦، ص٢٩٦.

٣ - تاريخ مدينة دمشق، ج٩، ص٣٧٨.

٤ - تاريخ الإسلام للذهبي، ج٦، ص٢٨٩.

٥ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص٢٥.

٦ - الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١١٠، البدايةو النهاية لابن كثير، ج٥، ص٣٣٢.

بوو، رایەکی تر دەڵێت بەڵکو سەدو حەوت ساڵ بوو،[١] یان دەوترێت نەوەدو شەش ساڵ بوو،[٢] یان دەوترێ سەدو بیست ساڵ بوو، بەڵام ئیبن ئەثیر وەلامی ئەو قسانە دەداتەوەو دەڵێت ئەو تەمەنە زۆرانەی دەوترێن راست نین چونکە کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینە ئەنەس تەمەنی دە ساڵان بوو، زیاترین ماوەش لەسەر ساڵی وەفاتی هاتووە ساڵی نەوەدو سێی کۆچی بووە، دەی بەو پێیە زۆرترین ئەگەر بۆ تەمەنی سەدو سێ ساڵە.[٣]

ئیمامی ذەهەبی رای راستتر دێنێت کە تەمەنی سەدو سێ ساڵ بووەو لە ساڵی نەوەدو سێی کۆچی وەفاتی کردووە.[٤]

ئەنەس لە بەصرە لەناو کۆشکەکەی خۆیدا (الطَف) کۆچی دوایی کردو هەر لە نزیك بەصرە ئەسپەردە کرا،[٥] ئەو کۆتا هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) بوو کە لە بەصرە کۆچی دوایی کرد.[٦]

قەطە نی کوڕی مودریکی کیلابی نوێژی مردووی لەسەر کرد.[٧]

---

١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٢٧- ١٢٨.

٢ - البدايةو النهاية لابن كثير، ج٥، ص٣٣٢.

٣ - أسد الغابة، ج١، ص١٩٤.

٤ - سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص٤٠٦.

٥ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٢٨.

٦ - البدايةو النهاية لابن كثير، ج٥، ص٣٣٢.

٧ - الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١١٠.

کاتێ ئەسپەردە کرا موویەکی پێغەمبەری خوای (ﷺ) لابوو لەژێر زمانیدا بوو، چونکە خۆی داوای کردبوو کە مرد ئەو مووە بخەنە ژێر زمانی و لەگەڵیدا ئەسپەردەی بکەن.[1]

هەروەها گاڵۆکێکی بچووکی پێغەمبەری خوای (ﷺ) لابوو داوای کرد لەگەڵیدا ئەو گاڵۆکەش بخەنە کفنەکەیەوە، بۆیە ئەو گاڵۆکەش خرایە ناو کفنەکەی‌و لەگەڵیدا ئەسپەردە کرا.[2]

ئەنەس کاتێ وەفاتی کرد نزیکەی سەد منداڵ‌و نەوەی خۆی دیبوو،[3] چونکە پێغەمبەر (ﷺ) نزای بۆ کردبوو،[4] ئەنەس خۆی دەڵێت بە جوانی شوێنەواری نزای پێغەمبەر (ﷺ) لە سامان و منداڵمدا بەدیدەکەم.[5]

---

١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٢٧.

٢ - أسد الغابة، ج١، ص١٩٤.

٣ - البدايةو النهاية لابن كثير، ج٥، ص٣٣٢.

٤ - الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١١١.

٥ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص٢٠.

## چلهەم: ماڵئاوایی بەرائی کوڕی مەعروور (رضي الله عنه)

بەرائی کوڕی مەعرور لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان، یەکێکە لە بەشداربوانی بەیعەتی یەکەمی عەقەبە، دەشوترێت لەو بەیعەتەدا یەکەم کەس بەیعەتی دا بەرائی کوڕی مەعروور بوو، یەکەم کەسیش بوو رووی کردە قیبلە، یەکەم کەسیش بوو سەبارەت بە سێ یەکی سامانەکەی وەسیەتی کرد.[١]

بەرائی کوڕی مەعروور لە سەفەرێکیدا کۆچی دوایی کرد،[٢] بەڵام تەرمەکەی لە مەدینە ئەسپەردە کرا، مردنی بەرائیش مانگێك پێش هاتنی پێغەمبەر (ﷺ) بوو بۆ مەدینە.[٣]

بەرائی کوڕی مەعروور پێش مردنی وەسیەتی کردبوو رووەو کەعبە ئەسپەردە بکرێت، بۆیە بەوجۆرە ئەسپەردەیان کرد،[٤] ئەم وەسیەتەیشی لای پێغەمبەر (ﷺ) کردبوو و پێغەمبەریش (ﷺ)بە وەسیەتەکەی رازی بووبوو.[٥]

هەروەها لە پێش مردنیدا وەسیەتی کرد سێ یەکی سامانی بدرێتە دەست پێغەمبەر (ﷺ) تا چی پێ باش بوو وای لێ بکات.[٦]

---

١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٨٢.

٢ - أسد الغابة، ج١، ص٢٦١.

٣ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٨٢.

٤ - أسد الغابة، ج١، ص٢٦٢.

٥ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٨٢.

٦ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٦١٩.

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) هاتە مەدینە، نوێژی مردووی لەسەر گۆڕەکەی بەرائی کوڕی مالیك ئەنجام دا،[١] ئەمەش یەکەم نوێژی پێغەمبەر (ﷺ) بوو لەسەر گۆڕی موسڵمانێك.

## چل و یەکەم: مالئاوایی حارثی کوڕی صەممە (رضي الله عنه)

حارثی کوڕی صەممە لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان،[٢] ئەم هاوەڵە خۆی ئامادە کرد بۆ غەزای بەدر و لە ناوچەی رەوحا پێغەمبەر (ﷺ) گێڕایەوە چونکە بریندار بووبوو، هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دواتر پشکی دەستکەوتی بۆ دانا وەك ئەوەی بەشداربووی غەزاکە بووبێت.[٣]

حارث لە غەزای ئوحودیشدا بەشداری کرد و لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) مایەوەو بەیعەتی مانەوە تا مەرگی پێدا.[٤]

حارث لە بیئر معوونەشدا بەشدار بوو و تیایدا لەگەڵ ئەو دەستەی تری موسڵماناندا کە ناپاکییان لێکرا شەهید بوو،[٥] ئەو کات کە هاوڕێکانیان کوژران

---

١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٨٢، الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٦١٩.

٢ - أسد الغابة، ج١، ص ٤٨٧، تأريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص ٢٥٢.

٣ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٧٨.

٤ - تاريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص ٢٥٢.

٥ - تاريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص ٢٣٦-٢٣٧.

حارث و عەمری کوڕی ئومەییە ئامادە نەبوون، سەیریان کرد باڵندە بەسەر ماڵیانەوەیە، کە هاتن دەبینن هاوەڵەکانیان کوژراون، حارث بە عەمری وت دەڵێیت چی بکەین؟ وتی من پێم باشە بچینەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام حارث وتی لە شوێنێ کە تیایدا مونذیر کوژراوە دەرناچم، بۆیە لێنەوی و خۆی گەیاند بە دوژمن و جەنگا تا کوژرا، ئەویش چ کوشتنێك، بە چەند رمێك تێیکەوتن تا کوشتیان.[١]

١ - أسد الغابة، ج١، ص ٤٨٧-٤٨٨.

# پێڕست



| لاپەڕە | بابەت |
|---|---|
| ٥ | پێشەکی |
| ٩ | یەکەم: ماڵئاوایی ئەبووبەکری صدیق (رضي الله عنه) |
| ١٥ | دووەم: ماڵئاوایی عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) |
| ٢٣ | سێهەم: ماڵئاوایی عوثمانی کوڕی عەففان (رضي الله عنه) |
| ٣٣ | چوارەم: ماڵئاوایی عەلی کوڕی ئەبووتالیب (رضي الله عنه) |
| ٤٧ | پێنجەم: مەرگی حەسەنی کوڕی عەلی (رضي الله عنه) |
| ٥٧ | شەشەم: ماڵئاوایی حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب (رضي الله عنه) |
| ٦٥ | حەوتەم: ماڵئاوایی عائیشەی کچی ئەبووبەکر (رضي الله عنها) |
| ٦٩ | هەشتەم: ماڵئاوایی حوسەینی کوڕی عەلی (رضي الله عنه) |
| ٧٧ | نۆیەم: ماڵئاوایی سەلمانی فارسی (رضي الله عنه) |
| ٨١ | دەیەم: ماڵئاوایی فاتیمەی کچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) |
| ٨٧ | یانزەهەم: ماڵئاوایی مەرگی خالیدی کوڕی وەلید (رضي الله عنه) |
| ٩١ | دوانزەهەم: ماڵئاوایی بیشری کوڕی بەرائی کوڕی مەعروور (رضي الله عنه) |

| | |
|---|---|
| سیانزەهەم: ماڵئاوایی ثابتی کوڕی قەیس (رضي الله عنه) | ٩٥ |
| چواردەهەم: ماڵئاوایی جەعفەری کوڕی ئەبووتالیب (رضي الله عنه) | ٩٧ |
| پانزەهەم: ماڵئاوایی حەنظەلە (رضي الله عنه) | ١٠٣ |
| شانزەهەم: ماڵئاوایی خوبەیبی کوڕی عەددی (رضي الله عنه) | ١٠٩ |
| حەڤدەهەم: ماڵئاوایی روقییەی کچی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) | ١١٥ |
| هەژدەهەم: ماڵئاوایی زەیدی کوڕی ثابت (رضي الله عنه) | ١١٨ |
| نۆزدەهەم: ماڵئاوایی زەیدی کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) | ١٢١ |
| بیستەم: ماڵئاوایی زەینەبی کچی جەحش (رضي الله عنها) | ١٢٤ |
| بیست و یەکەم: ماڵئاوایی زوبەیری کوڕی عەووام (رضي الله عنه) | ١٢٦ |
| بیست و دووەم: ماڵئاوایی سەعدی کوڕی موعاذ (رضي الله عنه) | ١٣٣ |
| بیست و سێهەم: ماڵئاوایی طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا (رضي الله عنه) | ١٤٠ |
| بیست و چوارەم: ماڵئاوایی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (رضي الله عنه) | ١٤٥ |
| بیست و پێنجەم: ماڵئاوایی عەبدوڵای کوڕی رەواحە (رضي الله عنه) | ١٤٩ |
| بیست و شەشەم: ماڵئاوایی عەبدوڵای کوڕی مەسعوود (رضي الله عنه) | ١٥٣ |
| بیست و حەوتەم: ماڵئاوایی عەمری کوڕی عاص (رضي الله عنه) | ١٥٧ |
| بیست و هەشتەم: ماڵئاوایی زەیدی کوڕی حارثە (رضي الله عنه) | ١٦٠ |

| | |
|---|---|
| بیست و نۆیەم: ماڵئاوایی عەمماری کوڕی یاسر (رضي الله عنه) | ١٦٦ |
| سیهەم: ماڵئاوایی عوثمانی کوڕی مەظعون (رضي الله عنه) | ١٧٢ |
| سی و یەکەم: ماڵئاوایی عیکریمەی کوڕی ئەبووجەهل (رضي الله عنه) | ١٧٤ |
| سی و دووەم: ماڵئاوایی فاطیمەی کچی ئەسەد (رضي الله عنها) | ١٧٥ |
| سی و سێهەم: ماڵئاوایی عەبدوڵای کوڕی زوبەیر (رضي الله عنه) | ١٧٧ |
| سی و چوارەم: ماڵئاوایی موصعەبی کوڕی عومەیر (رضي الله عنه) | ١٨١ |
| سی و پێنجەم: ماڵئاوایی ئەبوزەری غیفاری (رضي الله عنه) | ١٨٤ |
| سی و شەشەم: ماڵئاوایی ئەبووسەلەمە (رضي الله عنه) | ١٨٩ |
| سی و حەوتەم: ماڵئاوایی ئەسعەدی کوڕی زورارە (رضي الله عنه) | ١٩١ |
| سی و هەشتەم: ماڵئاوایی موعاذی کوڕی جەبەل (رضي الله عنه) | ١٩٣ |
| سی و نۆهەم: ماڵئاوایی ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) | ١٩٧ |
| چلهەم: ماڵئاوایی بەرائی کوڕی مەعروور (رضي الله عنه) | ٢٠٢ |
| چل و یەکەم: ماڵئاوایی حارثی کوڕی صەممە (رضي الله عنه) | ٢٠٣ |

# بەرهەمەکانی نووسەر

## نووسینەکان

١. ناسینی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ). (نۆ بەرگە). (ئامادەیە بۆ چاپ).

٢. ژیانی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ منداڵان. (چاپکراوە).

٣. ژیانی خەلیفەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ منداڵان. (چاپکراوە).

٤. هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ منداڵان.(چاپکراوە).

٥. ژیانی هەڵکەوتەکانی ئیسلام بۆ منداڵان(چاپکراوە).

٦. لە مێژووی ئیسلامیەوە. (ئامادەیە بۆ چاپ).

٧. ئیبن تەیمیە (ڕەچەڵەکو ڕۆڵی لە مێژووی ئیسلامیدا). (چاپکراوە).

٨. پێناسی هاوەڵان(رضي الله عنهم).(چاپکراوە).

٩. روانینێك بۆ مێژووی ئیسلامی(چاپکراوە).

١٠. مالئاوایی هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ). (ئەم بەرهەمەی بەردەستە)

## وەرگێڕانەکان

١١. چەند وانەیەك لە مێژووی ئیسلامی: شێخ محمد خضری بك (چاپکراوە).

١٢. پوختەی مێژووی ئیسلامی: د.محمد سهیل طقوش (چاپکراوە).

١٣. دەوڵەتی ئومەوی: پرۆفیسۆر دکتۆر عبدالشافی محمد عبداللطیف (چاپکراوە).

١٤. مێژووی دەوڵەتی عەبباسی: د.محمد سهیل طقوش. (چاپکراوە).

١٥. دەوڵەتی سەلجووقیەکان: د.علی محمد الصلابی، وەرگێڕان بەهاوکاری شاهۆ عومەر عارف ( چاپکراوە).

١٦. مەغۆل لە مێژوودا: د.فؤاد عبدالمعطی الصیاد(چاپکراوە).

١٧. مێژووی ئەییووبیو مەملووکیەکان: د. أحمد مختار العبادی (چاپکراوە).

١٨. دەوڵەتی عوسمانی: د.علی محمد الصلابی وەرگێرانی بە هاوکاری أحمد عبدالرحمان أحمد (چاپکراوە).

١٩. پوختەی شارستانیەتی ئیسلامی، نووسینی: د.رحیم کاظم محمد الهاشمی و أ. عواطف محمد العربی شنقارو.

٢٠. جەنگە گەورەکانو فتوحاتە ئیسلامیەکان: محمد سعید مرسی (ئامادەیە بۆ چاپ).

٢١. سەرچاوەکانی ئیمامی تەبەری (نامیلکە) نووسینی:د.محمد أمحزون، لە ماڵپەری ئەیووبی بڵاوکراوەتەوە.

٢٢. پوختەی مێژووی شارستانیەتەکان، محمود شاکر، بە هاوکاری مامۆستا مووسا. (چاپکراوە).

٢٣. پوختەی مێژووی ئەورووپا لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ: پرۆفیسۆر دکتۆر جڤری برۆن. (چاپکراوە).

٢٤. مێژووی نوێی ئەورووپا: چەند نووسەرێك، وەرگێڕان بە هاوکاری فارووق محمد محمدأمین (ئامادەیە بۆ چاپ).

٢٥. فیکری رۆژئاوا، ئەنوەرلجوندی.(چاپکراوە).

٢٦. بەراوردی ئایینەکان، نووسینی أنور الجندی. (چاپکراوە).

٢٧. ئیسلامو بانگەوازە رووخێنەرەکان، نووسینی: أنور الجندی (چاپکراوە).

٢٨. پیلان دژی ئیسلام، نووسینی أنور الجندی (ئەم بەرهەمەی بەردەستە).

٢٩. بەراوردێك لەنێوان غەزالیو ئیبن تەیمیەدا: د.محمد رشاد سالم ( ئامادەیە بۆ چاپ).

٣٠. ژیانی هاوەڵان( سێ بەرگ)، نووسینی: محمد یوسف الكاندهلوی.(چاپكراوە).

٣١. رەوتە هەناردەكان، نووسینی: أنور الجندی.چاپكراوە.

٣٢. بەگەورەدانانی خواو حوكمی ئەوەی قسەی پێ دەڵێت(نامیلكە)، نووسینی: د.عبدالعزیز الطریفی، لەماڵپەری ئیسلام هاوس بڵاوكراوەتەوە.

٣٣. بژاردەی نێوان ئیسلامو مەسیحیەت، نووسینی: أحمد دیدات. (لەژێر چاپدایە).

٣٤. ئیسلام و رێبازە فەلسەفیەكان، نووسینی: د.مصطفی حلمی.

٣٥. ١٥٠ بەسەرهات لە ژیانی ئەبووبەكری صدیق، أحمد عبدالعال الطهطاوی. (لەژێر چاپدایە).

٣٦. ١٥٠ بەسەرهات لە ژیانی عومەری كوری خەتتاب، أحمد عبدالعال الطهطاوی. (لەژێر چاپدایە).

٣٧. ١٥٠ بەسەرهات لە ژیانی عوسمانی كوڕی عەففان، أحمد عبدالعال الطهطاوی. (لەژێر چاپدایە).

٣٨. ١٥٠ بەسەرهات لە ژیانی عەلی كوڕی ئەبووتالیب، أحمد عبدالعال الطهطاوی. (لەژێر چاپدایە).